


# گڵێجاڵ

## (ناوەندی ناحیەی بەمۆ)

## لە بەڵگەنامە و بیرەوەرییەکاندا

کۆمەڵێك توێژەر



گڵێجاڵ لە بەڵگەنامە و بیرەوەرییەکاندا

کۆمەڵێك توێژەر




((( بڕیــــــار )))

بەستن بە حكامی ماددەی ( ١٣ ) وبڕگەی ( ٤ ) لە ماددەی ( ١٠ ) ی یاسای ژمارە ( ٢ ) ی ساڵی
( ١٩٩٢ ) وە پشت بە بڕیارنامەی ئەنجومەنی وەزیران لە كۆبونەوەی ڕۆژی ٢ / ١١ / ١٩٩٦ بڕیارمان دا بە
پێكهێنان / كردنەوەی ناحیەیەك لە پارێزگای كەركوك بە ناوی ( ناحیەی بەمۆ ) وە ناوەندەكەی ( گڵێجال ) دەبێ و لە ڕووی ئیداریەوە دەبەستێتەوە بە قەزای ( خانەقین ) .

# گڵێجاڵ

## (مەڵبەندی ناحیەی بەمۆ)

## لە بەڵگەنامە و بیرەوەرییەکاندا

# گڵێجاڵ

## (مەڵبەندی ناحیەی بەمۆ)

## لە بەڵگەنامە و بیرەوەرییەکاندا


**کۆمەڵێک توێژەر**

**دارشتنەوەی:**

یاسین تەها

**سەرپەرشتیی پرۆژە:**

تۆفیق کەریم

## ناساندنی کتێب

- ناوی کتێب: گلێجاڵ لە بەڵگەنامە و بیرەوەرییەکاندا
- ئامادەکردنی: کۆمەڵێک توێژەر
- دارشتنەوەی: یاسین تەها محەمەد
- سەرپەرشتیکردن و پێداچوونەوەی: تۆفیق کەریم
- بابەت: مێژوو
- دیزاینی ناوەوە: رەوشت محەمەد
- وێنەی بەرگ: سامان تاوگۆزی
- چاپ: یەکەم. ٢٠٢١

لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (١٨٣٤) ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە.

لەسەر ئەرکی وەزارەتی ڕۆشنبیری چاپکراوە

# پێڕستی بەشەکان

# وتەیەک



خوێنەری بەڕێز:
ئەم کتێبەی بەردەستت مێژوو و جوگرافیا و شوێنەوار و کەلەپوور و پێکهاتەی گەورە گوندێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە تەمەنی زیاتر لە دووسەدو پەنجا ساڵە، بەڵام شوێنەوارە دێرینەکانی دەریدەخات هەرزاران ساڵ بەرلەئێستا ژیان و ئاوەدانی تێدا بووە.
جوانی ئەم کتێبە لەوەدایە نەخشەی جوگرافی تایبەتی بۆ دیزاین کراوە، کنەو پشکنینی شوێنەوارناسیی تایبەتی بۆ کراوە، زیاتر لە پەنجا پیاو و ژنی نەوەی پێشوو بابەتە جیاوازەکانیان بە زارەکی بۆ خوێندەوار و پسپۆڕانی نەوەی نوێی گوندەکە گێڕاوەتەوە، ئەوانیش بابەتییانە و زانستییانە بەرمەبنای ڕێبازی قوتابخانە نوێیەکانی مێژووی زارەکی هەرڵسەنگاندنیان کردووە و سەرلەنوێ سەرجەم زانیارییەکانیان بە زمانێکی پاراو داڕشتووەتەوە.
هەر بۆئەوەی کتێبەکە تێر و تەسەلتر دەرچێت و زانیارییەکانی گوزارشت لە کۆدەنگیی گلێجاڵییەکان کە پێی ناسراون، بەر لە بڵاوکردنەوەی چەندین خوێندەوار و کەسایەتی گوندەکە

پێداچوونەوەیان بۆ کردووە و بەسەرنج و زانیاری دەوڵەمەندیان کردووە.
دەکرێت بوترێت، ئەم کتێبە نوسینی کۆمەڵێک توێژەری گلێجاڵییە، کە پسپۆڕیی وردیان لە بابەتەکان هەیە، سەرجەمیشیان جێگەی شانازین و من دەزانم چەند دڵسۆزانە پڕۆژەکەیان بەرهەرم هێناوە، بەڵام دەکرێت بڵێین هەرموو گلێجاڵییەکان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ خاوەنی ئەم نوسینەن.
ئەوەی تائێستا من بینیبێتم ئەم کتێبە لە باشترین ئەو نوسینانەن لەم بوارەی مێژووی ناوچەیی و گوند و شارۆچکەدا نوسرابێت، بۆیە ئەگەر بە دواکەوتنی ڕەخنەمان لێگیرابێت کە چۆن گوندێکی نزیک لە هەزار ماڵی کە خاوەنی ئەو هەرموو خوێندەوارەیە تائێستا خۆیانیان بە نووسین نەناساندووە بە کوردستانیان؟ دڵنیام بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە ڕەخنەکە کاڵ دەبێتەوە و دەبێتە قەرەبووی دواکەوتنی نوسینەکە.

تۆفیق کەریم
٢٠٢٠/٩/١

## پێشەکی

مێژووی ناوچەیی (التاريخ المحلي) تەواوکەر و درێژکراوەی مێژووی گشتییە، هەرچەندە ئەم جۆرە میژووە گوزارشتە لە وابەستەیی نوسەرەکانی بە زەوی و زێدی خۆیانەوە، بەڵام لێکۆڵەرانی مێژووی هەر ناوچە و شار و گوندێک دەچنە قوڵایی و ریشەی هەندێ باس و بابەتەوە کە یارمەتیدەرێکی باشن بۆ تەواوکردنی وێنەی گشتی مێژووی وڵات و نەتەوە.

لەم ساڵانەی دوایشدا لەپەنا مێژووی ناوچەیی، گرنگیدان بە "مێژووی زارەکی" بەشێوەیەکی بەرچاو پەرەی سەندووە، ئەم جۆرە مێژووە، کە پشت بەیادەوەری و گێڕانەوە دەبەستێت، بایەخی هیچ کەمتر نییە لە مێژووی نوسراو و بەڵگەنامە، بەوپێیەی بیرەوەری و گوتەی شایەتحاڵەکان ئاوێنە و رەنگدانەوەی واقیعن، زۆر جاریش لە دێڕە نوسراوە پەرتەوازەکانی بەڵگەنامەکان ڕوونتر و پێکەوە گرێدراوترن .

ئەم کۆمەڵە توێژینەی لە بەردەستدایە هەوڵێکی جێبەجێکارییە لە هەردوو هونەری مێژووی ناوچەیی و زارەکی لەبارەی گەورە گوندی پشتکێوی بەمۆوە، سەرجەمیشیان لە چوارچێوەی کارێکی هاوبەشدا کۆکراونەتەوە بە ناونیشانی "گلێجاڵ لە بەڵگەنامە و یادەوەرییەکاندا".

### گرنگیی بابەت

یەکەمجارە کۆمەڵە توێژینەوەیەکی پشت ئەستوور بە سەرچاوە و بەڵگە، لەبارەی گلێجاڵ و ناوەندی ناحیەی بەمۆ، لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی زانستیدا ئامادە بکرێت، جگە

لەوەش لەم توێژینەوانەدا هەندێک لێکۆڵینەوەی شوێنەواری و نەخشەی جوگرافی خراونەتەڕوو لەبارەی گڵێجاڵ و ناوچەکە، یەکەمجارە بڵاو بکرێنەوە.

**هۆکاری هەڵبژاردن و ئامانج**

ئامانجی سەرەکیی لەم کارە بەر لەهەمووشت دۆکیۆمێنت کردن و پاراستنی ئەرشیف و کلتوری زانراوی گوندی گڵێجاڵ و دەوروبەریەتی بەپێی بەڵگە زانستییەکان، جگە لەمەش نەبوونی زانیاری و دەستڕانەگەیشتنی توێژەران و خوازیاران بەزانیاری لەسەر ئەم گوندە، هاندەرێکی گەورەیە بۆ ئەوەی ئێمە کە خەڵکی شوێنەکەین ئەم ئەرکە لە ئەستۆ بگرین، رەنگە ئێمە باشتر بتوانین بەسەر ئاستەنگەکاندا زاڵ بین و لە فەرهەنگ و کلتوری ناوچەکە بگەین، سەراپای هەوڵەکەش لەپێناو کۆمەڵێک ئامانجدایە؛ خزمەتکردنی گوندەکە و پشتکێوی بەمۆ، بەشداریکردن لە پڕکردنەوەی کەلێنێکی مێژویی، رزگارکردنی ئەرشیفی ئاوایی لە فەوتان، زانستخوازی و بەشکردنی زانیاری لەگەڵ خوێنەران و دۆستان و خوازیارانی بابەتی مێژوویی و کلتوریی .

**سنور و کات**

وەک لەناونیشانی دووەمی بەرهەمەکەوە دیارە (تۆمار و بیرەوەرییەکان)، بازنەی زەمەنیی توێژینەوەکە زیاتر سەدەی بیستەم و پاش دەرکەوتنی بەڵگەو تۆمارە فەرمییەکانە لە سەرەتای سەدەی بیستەم (1900) لەگەڵ گێڕانەوەی زارەکیی خەڵکانی بەتەمەن کە سنوری زانیاری و

بیرەوەرییەکانی ئەوانەی هێشتا لەژیاندا ماون، دەوروبەری 70_80 ساڵە .

**میتۆدی توێژینەوەکە**

بەهۆی ئەوەی کارەکە چەند بوارێک دەگرێتەوە (مێژوو، جوگرافیا، کەلەپوور، شوێنەوار)، هەرەوەها هەر بەشەو لەلایەن توێژەرێکەوە ئامادەکراوە، زیاتر لە شێوازێکی نووسین و دارِشتن و گێرانەوەیەکیان تێدا بەکارهاتووە، بەڵام لایەنە مێژوییەکەی کە بەشی زۆریەتی پشتی بە "میتۆدی لێکۆڵینەوەی مێژوویی" لەگەڵ میتۆدی "وەسفی شیکاری" بەستووە کە بەشێوەیەکی گشتی ڕەچاوکردنی ڕیزبەندیی مێژووی و بەدواداچوونی پەرەسەندنی ڕووداوەکانن لەگەڵ هەوڵی وێناکردنی بارودۆخی ڕابردوو وەک خۆی.

**سەرچاوەکان**

لە توێژینەوەکاندا تۆمار و بەڵگەنامە فەرمییە کوردی و عەرەبییەکان، دەستنووس و فۆتۆ و ئەرشیفی خێزانی و بیرەوەری خەڵکانی ناوچەکە سەرچاوەی بنەڕەتین، لەم میانەیەشدا و تایبەت بەم کارە زیاتر لە (50) دیمانەی ڕوبەڕوو لەگەڵ شایەتحاڵەکانی گلێجاڵ و دەرەوەی گوندەکە لەکات و ساتی جیاجیادا ئەنجامدراون، هەروەها کەڵک لە تۆماری دەنگی و ڤیدیۆیی خەڵکی ناوچەکە لەکۆندا وەرگیراوە، هەموو ئەو سەرچاوانەشی ڕاستەوخۆ بەکارهاتوون لە لیستی سەرچاوەکاندا هەن و دەنگی تۆمارکراوی شایتەحاڵەکانیش وەک ئەرشیفێکی دەنگیی پارێزراون.

**گرفت و کێشەکان:**

کاری لەمشێوەیە هەمیشە پڕ گرفتە، چونکە ئیشکردن لەناو کلتور پشوودرێژی و وردبوونەوەی زۆری پێویستە، لەرووی کۆمەڵایەتیشەوە چوونە ناو ئەم وردەکاریانەو ڕاگرتنی هاوسەنگی جۆرێک ریسک و سەرکێشییە و کاردانەوەی بەدوادا دێت، جگە لەوەش کێشەی هەرە سەرەکی بابەتەکان نەبوونی زانیاری نوسراوی ورد و پشتڕاستکراوە و چاپکراو بوو لەسەر مێژووی دوور و نزیکی ئاواییەکە، هەر ئەمەش وایکرد ئەم کارە ماوەی نزیکەی پێنج ساڵ زانیاری کۆکردنەوەی بچڕ بچڕی پێ بچێت

**هەوڵەکانی پێشتر**

بەر لەم کارەی ئێمە هەندێک هەوڵ و کەرەستەی سەرەتایی هەبوون کە هەندێکیان بۆ ئەم کارە بەکەڵک بوون و هەندێکیتریان وەک پێشینە شایەنی ئاماژە پێ کردنن، دیارترینی ئەوانەش :

- حاجی مەحمود عەبدوڵڵا (تەڵاخان) لە ساڵی (2008) چەند دیمانەیەکی ڤیدیۆیی تۆمارکردووە لەگەڵ کۆمەڵێک شایەتحاڵی گلێجاڵ و بەلەسۆ، کە ئێستا هیچیان لە ژیاندا نەماون و کەرەستەیەکی بەنرخن بۆ مێژووی زارەکی ناوچەکە، جگە لەوەش بەهۆی کارکردنی لە کردنەوەی ناحیەی بەمۆ، ئەرشیفێکی بەڵگەنامەیی دەربارەی گلێجاڵ

کۆکردۆتەوە، هەندێ بەرنامەی تەلەفزیۆنیشی لەئاوایییەکە ڕێکخستووە، سەرچەم ئەمانەش سەرچاوەی باش بوون.
- کۆچکردوو جەبار ئەحمەد (مەلا بەرزان بەلەسۆیی)، کە لەشاخ و سەردەمی پێشمەرگایەتی خۆی فێری خوێندەواری کردووە، کۆمەڵێک وتار و ئەرشیف و زانیاری لەسەر گلێجاڵ کۆکردۆتەوە، هەندێک لەوانەشی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردۆتەوە، لەم ڕێگەیەشەوە لە ناساندنی ئاوایییەکە و گرنگیدان بە باس و ناوی گڵێجاڵ جێگە دەستی دیارە.

**هاوکارانی تەواوکار**

خاوەنی بیرۆکەی ئەم کارە و هاندەر و ئاسانکەری لەمپەرەکانی بەردەمی کاک **(تۆفیق کەریم)** ـە، جگە لەوەش تا کۆتایی ئەرکی پێداچوونەوە و سەرپەرشتیکردنی گرتوەتە ئەستۆ، بەوپێیەشی بەشی زۆری لێکۆڵینەوەکە مەیدانییە لە بوارەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان، ڕێکخستنی دیمانە لەگەڵ شایتەحاڵەکان، گۆڕینی فایلە دەنگییەکان بۆ تێکست، ئامادەکردنی پاشکۆکانی کتێبەکە و هەندێ بابەتیتر، چەند کەسێک لە خۆ بردوانە هاوکاری پرۆژەکە بوون کە هەوڵەکانیان جێگەی سوپاس نرخاندنە، کە بریتین لە بەرێزان: **(م. عەفان ئەحمەد عەلی، عوسمان ئەحمەد عەلی، حەمید فایەق حەکیم)**، هەروەها **(م. تاریق نامیق کەریم)** هەڵەچنی زمانەوانیی کردووە.

**ناوەڕۆکی بەش و توێژینەوەکان**

ئەم بەرهەمە لە حەوت بەش و کۆمەڵێک پاشکۆ پێکدێت بەمجۆرەی خوارەوە:

- **بەشی یەکەم:** کۆمەڵێک زانیاری بنچینەیی و شوناس ئامێزە لەسەر گڵێجاڵ؛ ڕیشەی ناوی گوندەکە، پاڵنەرەکانی دروستبوونی، تایبەتمەندییەکانی، پەیوەندیی لەگەڵ دەوروبەر و دراوسێکانی لەگەڵ قۆناغە سەرەکییەکانی گەشەکردنی تا ئاستی ناحیە .

**بەشی دووەم:** تایبەتە بە شەن و کەوکردنی ژیانی ئاینی و کۆمەڵایەتی و ئابووری، لەم بەشەدا پوختەی ژیاننامەی مەلاو فەقێکان و زەقترین دیارە کۆمەڵایەتییەکان باسکراون، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی باری بژێوی خەڵک و سەرچاوەکانی داهات و شێوازی ژیان و پیشەو کاری دەستیان لە سەردەمەکانی ڕابردوودا.

**بەشی سێیەم:** لەسەر سێ وێستگەی هەرە گرنگی مێژویی ئاواییەکە هەڵوێستە دەکات کە بریتین لە: کوشتنی مەلا یوسفی گڵێجاڵ و ڕووداوەکانی دوایی لە تالانکردن و ئاوارەکردنی ئاواییەکە لە 1946، پاشان دامەزراندنی ئاوایی سەعداوا لە 1956 لەگەڵ ڕووداوەکانی سەردەمی شۆڕش و ئازادبوونی ناوچەکە لە چنگی ڕژێمی عێراقی لەسالانی شەستەکانی تا ڕاگواستنی لە 1978.

**بەشی چوارەم:** گوزەرێکی وردە بەژمارەی دانیشتوانی ئاوایی و ناوەرۆکی ئامارە فەرمییەکان، هەروەها گۆڕانگارییە کارگێڕییەکان لەگەڵ شیکردنەوە و ڕاڤەکردنیان تا دەگاتە قۆناغی ڕاگواستن بۆ ئۆردوگای زەڕایەن، هەر لەم بەشەدا سەرلەنوێ ئاوەدانبوونەوەی گوندەکە و پاشان کردنەوەی

ناحیەی بەمۆ و گەڕانەوە بۆ سەر سنوری کارگێڕیی پارێزگای هەڵەبجە خراوەتەڕوو .

**بەشی پێنجەم:** لە مێژووی کۆنی ئاواییەکە دەکۆڵێتەوە، سۆراغی شوێنەوارە دێرین و بەجێماوەکانی دەکات بە پشت بەستن بە کنەو پشکنینی مەیدانی و بەراوردکردنی بەو شوێنەوارە هاوشێوانەی کە لە ناوچەکانی تری کوردستاندا دۆزراونەتەوە، لەم کارە مەیدانییەشدا پشت بەگەلێک سەرچاوەی بیانی و ناوخۆیی و ڕاو بۆچوونی خەڵکانی شارەزا بەستراوە.

**بەشی شەشەم:** تایبەتە بەجوگرافیای گڵێجاڵ، پێگەی لە نەخشەی هەرێمی کوردستان و پارێزگای هەڵەبجە، لەگەڵ جۆری خاک و تۆبۆگرافیا و پێکاتەی خاکەکەی و سنوری لەگەڵ دراوسێکانی، گرنگیی ئەم بەشەش لەوەدایە یەکەم توێژینەوەی مەیدانی و جوگرافییە کە پشت ئەستورە بەنەخشەی تایبەت و نوێ زۆر لایەنی زانستی جوگرافیای سنوورەکە روون دەکاتەوە.

**بەشی حەوتەم:** کەلەپور و بەسەرهات و چیرۆکە دەماودەمەکانی ئاوایی لە خۆ دەگرێت بەدرێژایی قۆناغە جیاوازەکان، لەگەڵ خستنەڕووی ئەو پەند و ئیدیۆم و داستانانەی لەسەر زاری خەڵکی گڵێجاڵ بڵاون و تا ئێستاش بەکاردێت.

لەکۆتاییدا سوپاسی سەرجەم هاوکاران و دڵسۆزان و خەڵکانی خاوەن بیرەوەری و بەڵگەنامەی گڵێجاڵ و دەوروبەری دەکەین کە بەسنگی فراوان یارمەتیدەربوون

لەسەرکەوتنی ئەم کارە بەتایبەت لەسەردەمی بڵاوبوونەوەی پەتای کۆرۆنا، هەروەها ئەوانەی بەهەڵەچنی و پێدانی زانیاری و رێنمایی و دەستخستن و پێشنیارکردنی سەرچاوە یارمەتیدەربوون.

ماوە بوترێت ئەم کارەی لەبەر دەستدایە هەوڵێکە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنێکی زانیاری لەبارەی گوند و ناوچەکە ئەگەر هەر هەڵە و کەموکوڕیی و ناتەواوییەکیشی هەبێت، بە مەبەست نەبووە و مرۆڤ لە رێگەی هەڵەو لە بیرچووندایە، دەکرێت کەموکوڕییەکیش هەبێت لە قۆناغەکانی دواتر و چاپەکانی تردا راست بکرێتەوە، هیوای ئێمەش ئەوەیە کارەکە ببێتە هاندەرێک بۆ ئەوەی کاری هاوشێوەی تر بەتایبەت لەو گوندانەی پەراوێزخراون و وەک پێویست تیشکیان نەخراوەتە سەر.

# بەشی یەکەم
## هەندێ زانیاریی بنچینەیی لەسەر گلێجاڵ

یاسین تەها



ماستەری هەیە لە ئاین و ئاینزاکانی کوردستان لەوڵاتی مصر، توێژەرە لە ناوەندی کوردستان بۆ دۆکیۆمێنت و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی ـ زانکۆی سلێمانی، دوو کتێب و ژمارەیەك وتار و توێژینەوەی بڵاوکراوەی

## مێژووی دامەزراندن:

گڵێجاڵ گوندێکە لە شێوەی شارەدێ لە نزیک خاڵی سنوریی پشتە و دەڤەری "پشتکێوی بەمۆ" لە باشووری پارێزگای هەڵەبجە" [1]. ئەگەرچی بنکۆڵکاریی شوێنەوارەکانی ئاواییەکە دەریدەخات ژیان و ئاوەدانی لە سنوری ئێستای ئەم ئاواییە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمەکانی پیش زایین[2]، بەڵام باوەڕ وەهایە سەرەتای بنیاتنانەکەی بەم پێکهاتە و ناوەی ئێستای بگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە (1800 ز)، ئەمەش بە لێکدانەوەی ناوەندی تەمەنی "باوکانی دامەزرێنەر"ی ئاوایی کە باپیرانی هۆز و خێڵ و بنەماڵەکانی ئێستان. لەبارەی ڕیزبەندیی و زنجیرەی زەمەنیی کۆبوونەوەی خەڵکیش لە گوندەکە، بۆچوون و لێکدانەوە و حیکایەتی جۆراوجۆر هەن، باوترینیان خاوەنداریێتی زەوییەکانی دەوروبەری ئاوایی و سەرچاوەکانی ئاوە، بەتایبەت کانیاوی (گەچێن)[3] کە سەرچاوەی سەرەکی ئاوی خواردنەوە و

---

(1) Cambridge university press 2013, map4 Ancient and modern frontiers of suleymanieh: map to illustrate major rawlison route from zuhab to xuzistan in 1836.

(2) بڕوانە بەشی شەشەم کە تایبەتە بە شوێنەوارەکانی گڵێجاڵ لەم کتێبە.

(3) چاوپێکەوتنی عەزیز محەمەد ئەحمەد، گڵێجاڵ، 2 /7/ 2020 ؛ چاوپێکەوتنی ئەحمەد سۆفی کەریم، هەڵەبجە، 12/ 6/ 2020 ؛ چاوپێکەوتنی مەحمود مستەفا نادر، زەڕایەن، 5/ 6/ 2020.

ئاودێریی گوندەکە بووە و هۆکاری کۆبوونەوەیان بووە لەم جێگەیەی ئێستا.

لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو، گڵێجاڵ لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە، هاوشێوەی 95% گوندەکانی تری کوردستان بووە، چونکە دانیشتوانەکەی کەمتر بووە لە 500 کەس[4]، بەڵام بەپێی ئامار و ڕووبەر گڵێجاڵ گەورەترین گوندی پشتکێوی بەمۆ بووە، هەروەها یەکێک بووە لە گەورە گوند و نشینگەکانی قەزای هەڵەبجە[5]، ڕەنگە بەشێک لە هۆکاری ئەمەش بۆ شێوە و پێکهاتە چیاییەکەی بگەڕێتەوە کە ئاسایش و ئارامی زیاتری تێدا بووە، هەندێک دوور بووە لە زەوییە کشتوکاڵییەکان و لە دامێنی چیادا بووە، ئەمەش تایبەتمەندیی زۆرێک لە گوندە قەرەباڵغ و گەورەکانی ناوچەکە و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە[6].

## ناوی گڵێجاڵ

هیچ زانیارییەکی پشتڕاستکراوە لەبەردەستدا نییە لەبارەی ناوی "گڵێجاڵ"، لە هەندێ دۆکیۆمێنتی فەرمیشدا بە "گلە جاڵ"

(4) خەلیل ئیسماعیل و ئەیوب خەلیل: جوگرافیای دێ نشینی.. کوردستانی عێراق وەک نمونە، هەولێر، 2012، لا 143.

(5) بڕوانامە ئامارەکانی 1957 و 1977 لەبەشی چوارەمی ئەم کتێبە.

(6) خەلیل ئیسماعیل و ئەیوب خەلیل: سەرچاوەی پێشوو، لا 29 _33.

یان "گڵیجان" ناوی هاتووە [7]، بەڵام ناوە ڕاستەقینەکەی هەر "گڵێجاڵ" ـ ە، دیارە ئەو گۆڕانکارییەش بەهۆی نەشارەزایی نووسینی دروستی ناوەکەوە بووە کە کێشەیەکی سەرەکی ناوە کوردییەکانە بۆ ڕێنووسی عەرەبی[8] . کۆمەڵێک لێکدانەوە و هاوناوی گڵێجاڵ لەسەر زاری خەڵکەکەی هەن؛ (گڵی جوان)، (کاڵی جاڵ)، (کەنەجاڵ)، (عێلی جوان) بەڵام زۆربەی بۆچوونەکان لەسەر ئەوەن ناوی "گڵێجاڵ" پەیوەندی بە گڵی جوانەوە هەیە لە دەوروبەری ئاواییەکە، لێکدانەوە زمانەوانییەکانیش هەر لەسەر ئەمەن، ئەم گڵە لە قوڕکاریی و خانوو سواقدان بەکارهاتووە، کانەکەشی پێی وتراوە (کەنەجاڵەکە)[9]، شوێنی ئەم گڵە جوانەش لە بەشی سەرەوەی گوندەکەدایە لە قەدپاڵی چیای خوشک، بەپێی گێڕانەوەی هەندێ لە پیاوانی بەتەمەنیش، بەوهۆیەوە پێشتر

---

(7) هەندێک لە ڕەگەزنامەی باری شارستانی خێزانەکانی ئەم گوندە لە ساڵی 1942 بە "گلە جاڵ" هاتووە ؛ بڕوانە وقایعی عێراقی لە 3564 لە 14 / 2/ 1955 بە "کلیجان" ناوی هاتووە.

(8) هەندێک دەستخەتی مەلاکانی گڵێجاڵ لەبەردەستدان ناوەکە هەر "گڵێجاڵ" ـە، ئەمە جگەلەوەی لەسەر زاری خەڵک و دانیشتوانەکەی دەیان ساڵە هەر بە "گڵێجاڵ" هاتووە، لە تۆمارە فەرمییەکانیشدا دواتر ڕاستکراوەتەوە و هەر بە گڵێجاڵ (کلیجال) تۆمارکراوە بەتایبەت ئامارە فەرمییەکانی 1957 و 1977.

(9) چاوپێکەوتنی عەبدولڕەحمان حەمەساڵح، زەڕایەن، 3/ 7/ 2020 ؛ چاوپێکەوتنی فەتاح محەمەد (زێبا)، گلێجاڵ، 12/ 7/ 2020.

گوندەکە ناوی "کەنەجاڵ" بووە، دواتر وردە وردە بووە بە گڵێجاڵ[10].

## پێکهاتە

گڵێجاڵ لە کۆمەڵێک هۆز و خێڵ و بنەماڵەی جیاجیا پێکدێت کە بریتین لە: هەسەن، خەلیفە، ڕەحیم، حەمەوەیس، حاجی وەیس، وەستا قادر، ڕەزا وەیس، مەلا محەمەدی ئەسپەری، شێخەکانی سپێوەری، هەیگەیی، لەگەڵ چەند بنەماڵەیەکیتر: مام فەتاح، حەمەی سۆفی قادر (زەریفێ)، سەید محەمەد، عەلی مستەفا، ئەوڕەحمانی براخاس، عەبدوڵا سەیدە و حەمەی دێ ئاڵتوون[11]، هەریەک لەو پێکهاتانەش چیرۆکێکی تایبەتی هەیە لەبارەی کۆچ بۆ ئەم گوندە و ڕەچەڵەک و نیشتمانی پێشتر و بنەڕەتییان، ڕیشەی هاوبەشی زۆربەشیان؛ عێلی گەورەی جاف و ناوچەی سەلاسی باوەجانی و دەوروبەری شاری جوانڕۆیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

ئەم خێڵ و بنەماڵانە ئەگەرچی مێژووی هاتنیان بۆ ئاواییەکە جیاوازی هەیە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان گڵێجاڵ بە

(10) چاوپێکەوتنی عەباس عەبدولقادر، هەولێر، 10/ 7/ 2020؛ فەتاح محەمەد (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

(11) چاوپێکەوتنی عەزیز مەحمود محەمەد ئاوایی گڵێجاڵ، 26 / 9/ 2015؛ چاوپێکەوتنی ئەحمەد کەریم عەبدوڵلا، سیروان، 12/ 6/ 2020؛ چاوپێکەوتنی حاجی محەمەد یوسف حەمە، دەربەندیخان، 29 / 5/ 2020.

ناسنامەی سەرەکی خۆیان دەزانن[12]، بەشی هەرە زۆری خەڵکی گوندەکەش بەهۆی ژن و ژنخوازییەوە تێکەڵ بوون و خزمی یەکترین و لە دەوری ناوی گڵێجاڵ کۆبوونەتەوە، لەو دەستخەت و نوسراوانەشی کە لە مەلا کۆچکردووەکانی گڵێجاڵ بەجێماون، هەر نازناوی "گڵێجاڵی" هەیە[13]، لەو جێگایانەشی خوێندوویانە هەر بە "گڵێجاڵی" ناسراون[14]، دەکرێت ئەمەش وەها بخوێنرێتەوە کە خێڵ و بنەماڵە جیاوازەکانی گوندەکە هەر پێشینە و ڕەچەڵەکێکیان هەبووبێت، لە پاش گیرسانەوەیان لەم ئاواییە لەگەڵ ئەو پێکەوەژیان و خزمایەتییە نوێیەدا ئاوێتە بوون کە لەم گوندە دروست بووە.

### لە نێوان گوند و عەشیرەت

هەرچەندە مانا عەرەبییەکەی عەشیرەت جەخت لە هاوخوێنی و یەک باوانی دەکاتەوە[15]، بەڵام وەک ڕەگەزناسی عێراقی عەباس عەزاوی ڕونیکردۆتەوە لەناو کورددا چەمکی

---

(12) چاوپێکەوتنی باوا ساڵح ئەحمەد نادر، زەڕایەن، 5/ 6/ 2020؛ ئەحمەد کەریم عەبدوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

(13) هەندێک لەو دەستخەتانە کە هی مەلا سەعید، مەلا مەحمودی فەرەج، مەلا یوسفن لە ناوەندی کوردستانی زانکۆی سلێمانی ئەرشیفکراون.

(14) چاوپێکەوتنی مەلا عەلی کۆکۆیی، هەڵەبجە، 19/ 6/ 2020 ؛ چاوپێکەوتنی مەلا حەمەئەمین سەراوی، هەڵەبجە، 27/ 6/ 2020؛ چاوپێکەوتنی حەمە تۆفیق دەروێش ئەبوبەکر، هەڵەبجە، 29 / 6/ 2020.

(15) جامعة بيرزيت، الأنطولوجيا العربية، عشيرة، https://ontology.birzeit.edu/، (22 / 6/ 2020).

عەشیرەت بەجۆرێکی ترە، زیاتر کۆمەڵگایەکی بچووکە بۆ کۆمەڵێک خێزانی هاوئاست کە مەرج نییە یەک باوانیان هەبێت، ئەم خێزانانە پاش کۆچ و ڕەو هەندێکیان بەناوی نیشتمانی نوێوە ناسراون، هەروەها ڕیشە و سەرچاوەی یەکەمی خۆیان لە بیرکردووە، ئەم جۆرە عەشیرەتانەش بەرجەستەکردنی مانای مامەڵە و پێکەوەییە لە زمانی عەرەبی (العِشرة)[16] . لەلایەکی تریشەوە هەندێکجار، عەشیرەت بەواتا بەرفراوان و سەردەمییانەکەی بۆ ئەو گرووپە گەورانەش بەکارهاتووە کە خاوەنی یەکگرتوویەکی بەهێزن[17]، بەتایبەت ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەی تەوتەمێکیان هەبووە، لەگەڵ خاکێکی هاوبەش و یەکگرتویی لەنێوان ئەندامەکانیان [18]، هەندێک لە شارەزایانیش زەوی و خاکی هاوبەشیان بەیەکێک لە بنەماکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی داناوە لە بری ڕەچەڵەکی هاوبەش و هاوخوێنی [19] ، هەندێکی وەک (leach) و (Rudolph) یش بێ سڵەمینەوە عەشیرەت بەدەستەیەکی سیاسی دەزانن کە مەرج نییە وەک تایفە خزمی یەکتر بن[20]، ئەگەر تێکڕای ئەم پێوەرانەش بەسەر گلێجاڵدا جێبەجێ

---

(16) موسوعة عشائر العراق، الدار العربية للموسوعات، بيروت _ بغداد، 1/ 137.

(17) بیرو، آلن ، فرهنگ علوم اجتماعی (انگلیسی ـ فرانسه ـ فارسی) ترجمه ، باقر ساروخانی، چاپ چهارم، تهران ، کیهان، 1380. لا 433

(18) جامعه بیرزیت، سەرچاوەی پێشوو.

(19) الأكراد، مطبعة شفيق، بغداد، 1972، ص 150.

(20) مارتین ڤان برونەسن، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، وەرگێڕانی، کوردۆ عەلی، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، 2010، لا 110.

بکەیت، زۆربەیان لە چەشنی خاکی هاوبەش و یەکڕیزی و تێکەڵی لەم گوندەدا هەن و ڕەنگە بارتەقای نەبوونی خزمایەتی هاوخوێنی (باوان) بکەنەوە، بەتایبەت کە خزمایەتی هاوسەرگیرییان زۆر زۆرە،

هەر لەم روانگانەشەوە خەڵکی گەورە گوندی گلێجاڵ زۆرجار خۆیان بە عەشیرەت زانیوە، لە قسە و ئاخاوتنەکانیشیاندا بەزۆری بەکاریدەهێنن[21]، بەوپێیەی ئەگەرچی ناچنەوە سەر یەک باوان وەک ڕەچەڵەک، بەڵام پەیوەندییەکی قووڵ و هەمەلایەن بەیەکتریانەوە دەبەستێتەوە؛ ژن و ژنخوازی، هاوگوندی، زەوی، مێژوو، دۆستایەتی ...هتد. لە دەرەوەی خۆشیان ناوبەناو هەر بە عەشیرەت ناسراون[22]، بەڵام سەرباری ئەمەش هێشتا هەر هەیانە هەر شوناسی گوند و ئاوایی بۆ گلێجاڵ بەکاردەهێنێت[23] بەوپێیەی هەندێک لە بنەماڵەکانی پێیانوایە درێژکراوە و خزمیان لە دەرەوەی ئاواییەکە هەیە، هیچ کاتیش یەک سەرۆکیان نەبووە وەک لەسیستمی عەشیرەتایەتی کوردستاندا باوە .

---

(21) لەو قسانەی زۆر لەسەر زار باوە، نزاکردنە بۆ سەلامەتی "قەوم و عەشرەت"، یان سوپاسکردنی "قەوم و عەشرەت" ـە لەکاتی بەدەمەوەچووندا، یان یەکترناسین پاش دابڕانی زۆر.

(22) بڕوانە مەلا عومەر عەبدولعەزیز الحسيني، بۆ برایانی عەشیرەتی گلێجاڵ، 20 / 10/ 2003 "نامەی دەستخەت"، وێنەی لە ناوەندی کوردستان، زانکۆی سلێمانی هەیە.

(23) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو؛ فەتاح محەمە (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

## پاڵنەرەکانی کۆبوونەوەی خەڵك

توێژینەوە جوگرافییەکانی پەیوەست بە دابەشبوونی دانیشتوان و پێکهاتنی گوندەکان، ئاماژە بە چەند هۆکارێکی هاندەر دەکەن بۆ کۆبوونەوەی خەڵک و دروستبوونی گوند لە کوردستان لەوانەش: بەرزونزمی خاک و هەڵکەوتە، کەشوهەوا، سەرچاوەی ئاو لەگەڵ فاکتەری مێژوویی کە زیاتر پەیوەندی بە ئاسایش و ئۆقرەییەوە هەیە[24]، ئەگەر ئەم پێوەرانەش بەسەر ئاوایی گڵێجاڵدا جێبەجێ بکرێت بەشی زۆری هەن، هەڵکەوتەکەی لە دامێنی چیایە و بەردەمی دەشتە کە بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری گرنگە، هەروەها سەرچاوەی ئاوەکەی؛ گەچێن، کانیاوە، ئەمەش لای خەڵک پەسەندە بەوپێیەی فێنک و سازگار و بەردەوامە، جگەلەوەش کەشوهەواکەی لەبارە بۆ کشتوکاڵ و هاوشێوەی و زۆرێک لە گوندەکانی تری کوردستانیش تاڕادەیەک ئاسایشی تێدا بەباشی دابینکراوە بەهۆی ئەوەی پشتی لە چیا بووە.

**شوناسی دراوسێکان**

ئەگەرچی گڵێجاڵ لە پشتکێوی بەمۆیە، بەڵام بەشێکیشە لەو ڕووبەرە جوگرافیی و کلتوورەی پێی دەوترێت "ئەوبەری سیروان"، لەم ناوزەدکردنەشدا هەڵەبجە و دەربەندیخان

(24) خلیل اسماعیل محمد، السكان والمسألة السكانية فی كردستان العراق، جامعه صلاح الدين، أربيل، 2010، ص 72_ 77.

بەسەنتەر گیراوە، چونکە ئەم ناوچەیە دەکەوێتە بەشی ئەوبەری ڕاڕەوی ڕووبارەکەوە بۆ هەردوو شارەکە[25].
گڵێجاڵ لە باکوورەوە هاوسنورە لەگەڵ گوندی قەڵپ (تێکەڵەیەکن لە سادات و میرکی و گۆو)، لە ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتیشەوە لەگەڵ گوندەکانی گمە (تاوگۆزی) و، پشتە (تێکەڵەیەکە لە 11 بنەماڵە)، لە بەشی باشووری لەگەڵ گوندی بەلەسۆ (باوایی و هەندێک ماڵی گڵێجاڵی) تێدا نیشتەجێیە، لە بەشی ڕۆژئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ گوندەکانی ناحیەی مەیدانی سەر بە گەرمیان (زیاتر شەرەف بەیانین). هەروەها لە ڕێگەی گمە و بانی بۆڵانەوە هاوسنوریشە لەگەڵ ناوچەی تاوگۆزی کە پردی پەیوەندیی نێوان گڵێجاڵ و ڕووباری سیروانە لەسەر ڕێگای هەڵەبجە (نزیکەی 70 کم) [26]. لەبەری ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە (ئێران)، پشتکێوی بەمۆ دراوسێی سەلاسی باوەجانی (شێخ سێڵە) و ناوچەکانی دەوروبەری جوانڕۆیە. سەلاس لە ڕۆژئاوای پارێزگای کرماشانە، هاوسنورە لەگەڵ گوندی پشتەی دراوسێی گڵێجاڵ، ئەم ناوچەیە کە لە نزیکەی 250 گوند پێکهاتووە لە نێوان چیاکانی بەمۆ و گاڕێ - دایە، ناوەندەکەی شارۆچکەی تازاوایە، زۆرینەی هەرە زۆری

---

(25) ئەوبەری سیروان ناوێکی زارەکی و دەماودەمە، بەڵام لە هەندێ یاداشتنامەشدا هاتووە، بڕوانە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ڕۆژگاری ژیان، چاپ و انتشارانی کوردستان، 2015، لا 199.

(26) بڕوانە خريطة كادسترو (10/ 4/ 1954)، مركز قضاء حلبجة، مقاطعة 46.

خەڵکەکەی جافن و بە کرمانجی ناوەڕاست و شێوەزاری جافییانە قسە دەکەن، بەگشتی مسوڵمان و سوننە مەزهەبن، بەڵام هەندێک گوندیان سەر بە یارسانن (قەڵخانی) و بە کەلهووڕی، قسە دەکەن. بەگشتی پێکهاتەی زۆرینە و بەربڵاوی سەلاس: باوەجانی، قوبادی، وەڵەدبەگی - ن هەر لەبەرئەمەش پێی دەوترێت سەلاس (سێ)، جگە لەوانەش: چەند عەشیرەتی تری تێدا نیشتەجێیە، لەوانەش: تاوگۆزی، میرکی و باوایی .[27] کە درێژکراوەیان لە پشتکێو هەیە، سەرجەم ئەم عەشیرەتانەش لەسەر جاف ئەژمار دەکرێن کە چەتری کۆکەرەوەی خەڵکی بناری بەمۆ و دیوی ڕۆژهەڵاتە.

**پەیوەندیی لەگەڵ دەوروبەر**

بەپێی ئاماژە و گێڕانەوەکانی بەردەست سیمای زاڵ و بەردەوامی پەیوەندیی خەڵکی گلێجاڵ لەگەڵ دەوروبەرەکەیاندا دۆستایەتی و تەبایی بووە، لەگەڵ ئەمەشدا ناوبەناو هەندێک پێشهات لەمەودای کورتدا برێک گرژیی دروست کردووە، بۆ نمونە لە هەرای 1946" [28] لەگەڵ بەشێک لە تاوگۆزی ئەودیو سنور و بەشی ئێرانی ئەم

---

(27) عەلی قەنبەری، ناساندنی پارێزگای کرماشان، http://www.brwska.net/articles/item/672 (2012/3/22).

(28) لە بەشەکانی دواتر لەسەر ئەم ڕووداوە ئەوەستین کە موریدانی شێخی بیارە لە سەلاسی باوەجانی و گوندەکانی شێخ سێڵە و بانەبۆر و دەوروبەرییەوە هێرشیان کردوەتە سەر گلێجاڵ. چاوپێکەوتنی حەمە عەلی سۆفی محەمەد، زەڕایەن، 4/ 7/ 2020.

عەشیرەتەدا کەوتوونەتە کێشە[29]، ئەوکاتەشی کە ململانێی پارتی و شیوعی گەشتووە بە ناوچەکە لەگەڵ هەندێ لە باوابییەکاندا ناکۆک بوون بەهۆی دابەشبوونی سیاسییەوە [30]، بەڵام ئەم گرژییانە زۆر درێژەیان نەکێشاوە و سەرەنجام دۆستایەتی زاڵ بووە، تەنانەت لەو وێستگانەشی ئاماژەی بۆ کرا هەرجارە و بەجۆرێک هاوکاریی لەگەڵ دەوروبەر هەبووە، بۆ نمونە لە هەراو تالآنی 1946 بەدەستی لایەنگرانی شێخانی بیارە لەبەری ئێرانەوە، باوابییەکانی بەلەسۆ و چواردارانی یارمەتی گڵێجاڵیان داوە [31]، جگەلەوەش خێزانە ئاوارەکانیان بەسەر گوندەکانی دەوروبەردا دابەش بوون و پەنا دراون[32]، ماوەیەکیش لە ساڵی (1963) کە خراپ لێکگەیشتن کەوتووەتە نێوانیانەوە لەگەڵ هەندێک لە باوابییەکان بەهۆی دۆزینەوەی تەرمێکەوە لە نزیک سنوری گڵێجاڵ، تاوگۆزییەکان نێوانگیرییان کردووە و بەئاشتەوایی کۆتایی بە ساردی نێوانیان هێناوە تا دواتر دەرکەوتووە بکوژ خەڵکی گوندێکیترە[33].

---

(29) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو؛ حەمە عەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(30) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو

(31) عەزیز بەلەسۆیی، زەڕایەن، 10/ 6/ 2020؛ چاوپێکەوتنی مەحمود مستەفا نادر، زەڕایەن، 5/ 6/ 2020.

(32) بڕوانە بەشی سێیەم؛ وێستگە مێژوییەکانی ئەم کتێبە و تەوەری ئاوارەبوونی گڵێجاڵ.

(33) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

لەناو گلێجاڵ و باوایی و تاوگۆزییەکاندا ژن و ژنخوازی و خاڵ و خوشکەزای زۆر هەن، لەدوای ئەوانیش تێکەڵییان لەگەڵ قوایی و باوەجانی زیاترە، ڕێگای هاتوچۆی گلێجاڵ بۆ هەڵەبجە بە ناوچەی تاوگۆزیدا گوزەر دەکات، بەرەو چیای بەمۆ و سەرتەکیش بەناو سنوری باواییەکان و هەمیشە هاتوچۆیان بەسەر یەکتردا هەبووە، لەوەڕگا و مەرعە و زەوییەکانیان هاوسنورن، هەندێک لە ماڵی گلێجاڵیش لە گوندی بەلەسۆ دەژین و تێکەڵن، هەندێک جاریش کۆمەڵێک لە پیاوانی گلێجاڵ بۆ بەهاناوەچوونی تاوگۆزییەکانی گوندەکانی سەلاسی باوەجانی چەند کەسیان سنوریان بڕیوە و چەند ڕۆژ لەوێ ماوەنەتەوە[34] .

لە ساڵی (1975) گوندەکانی ئەوبەری سیروان (لیوا دیالە) بەر ڕاگواستن کەوتوون، دەوروبەری (30) ماڵ لە گوندەکانی هۆرێن و کوێرەک کە لەنیوە زیاتریان هۆرێنی بوون، بەهۆی ئەوەی ئاژەڵداربوون ئۆدروگا و شارەکانیان پێ خۆش نەبووە، لە گلێجاڵ نیشتەجێبوون تا ساڵی (1978ز) هەموویان پێکەوە ڕاگوێزراون، لە ماوەی ئەم سێ ساڵەشدا پەیوەندییەکی زۆری دۆستایەتی و تێکەڵی لە نێوان ئەو خێزانانەدا دروست بووە، هەر بەهۆی ئەم ڕاگواستنەشەوە هەندێ لە منداڵەکانی ئەو گوندانە

---

(34) دیارترینیان باوا قادر، حەمەی تەڵاخان، کەریمی ئەوڕەحیم بوون. هەمان سەرچاوە.

لەدایکبووی گڵێجاڵن و گەورەکانیشیان یادگارییان لەگەڵ خەڵکی ئاواییەکە هەیە[35].

**تایبەتمەندیی ئاواییەکە**

وەک زۆرێک لە ڕۆژهەڵاتناسان باسیان کردووە، تا ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاکان، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە کوردستان لەسەر بنەمای خێزان و سەرۆک هۆز و بنەماڵە و ئاغا بنیاتنرابوون، لایەنی ئاینی ـ ش، پەیوەست بووە بە شێخ و پیر و سۆفی و دەروێشەکانەوە، دەسەڵاتی شێخەکان درێژخایەنتر بووە لە هی دەرەبەگەکان بەهۆی کاریگەریی دەسەڵاتە ئاینییەکەوە [36]، بەڵام ئەم ڕێسایە، لە گوندی گڵێجاڵی پشتکێوی بەمۆ هەندێ گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە، لەلایەک گوندەکە ئاغای تیا نەبووە، لەلاکەی تر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی شێخ تەنها سێ مانگ هەڵیکردووە (1946)[37]. بەدرێژایی سەردەمی پاشایەتی (1921_1958) لە بناری بەمۆ و گوندەکانی پشتکێودا، دوو جەمسەری سەرەکی هێزی ئاینیی و کۆمەڵایەتی هەبوون، کە وەسمان بەگی عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی و شێخانی نەقشبەندی بیارەیە کە ئەوکات شێخ عەلائەدینی زیائەدین ڕابەریان بووە. لەم نێوانەشدا

---

(35) چاوپێکەوتنی محەمەد ئەمین مەحمود، زەڕایەن، 5/ 7/ 2020.

(36) مارتین فان برونەسن، ئاغاو شێخ و دەوڵەت، وەرگێڕانی کوردۆ عەلی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، بەرگی یەکەم چاپی دووەم، (1999)، 17_20 ؛ دیرک کینن، الکرد وکردستان، ترجمە صلاح عرفان، کوردولوجی، السلیمانیة، 2010، ص 22.

(37) لە بەشی پێنجەم کە تایبەتە بە وێستگە مێژووییەکانی گڵێجاڵ، وردەکاریی لەسەر هاتنی شێخ و هەرای 1946 باسکراوە.

گلێجاڵ کە گەورە گوندی پشتکێوی بەمۆیە [38] کەوتووەتە بەرداشی ململانێی ئەم دوو جەمسەرە و هەرلایەک بەلای خۆیاندا ڕایانکێشاوە[39]، هەردوولاش لەسەر زەوی گلێجاڵ ناکۆکیان هەبووە و گەشتووەتە ڕادەی شەڕە سکاڵای یاسایی، بەهۆی ئەوەی بەشی هەرە زۆری زەوییەکانی گوندەکە ئەمیری ـ ن و دەوڵەت ڕازیی نەبووە سەرجەمیان لەسەر دەرەبەگ و شێخەکان تاپۆ بکات، خەڵک زەوییەکانی خۆیان بۆ کشتوکاڵ بەکارهێناوە[40].

سیستمی بەڕێوەبردن و نوێنەرایەتی گوند لە ئاوایی گلێجاڵدا، لە دوای گەیشتنی تۆمار و دەسەڵاتی میری بەناوچەکە لەدوای بیستەکانی سەدەی رابردوو، موختاریی و کوێخایی بووە[41]، بەم پێیەش سەرۆک عەشیرەتی تێدا نەبووە، هیچ کاتیش ئاغا لە گوندەکەدا نەبووە[42].

موختارەکانی گلێجاڵ هەمیشەیی نەبوون و گۆڕاون، هەریەک لەوانەش لە بنەماڵەیەکی جیاواز بووە[43]، دیارترین

(38) وزارة الداخلية (1962): الموسوعة الإحصائية عن التقسيمات الإدارية، في الجمهورية العراقية، مطبعة الإدارة المحلية، بغداد

(39) چاوپێکەوتنی عەزیز محەمەد ئەحمەد، گلێجاڵ، 2/ 7/ 2020.

(40) چاوپێکەوتنی مەلا عەبدوڵڵا حمە حەمە وەیس، دەربەندیخان، 29/ 5/ 2020؛ ئەحمەد کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

(41) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو.

(42) مەلا عەبدوللا حەمە حەمەوەیس، سەرچاوەی پێشوو؛ عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(43) چاوپێکەوتنی ئەمنە شێخ عارف، زەڕایەن، 9/ 6/ 2020؛ چاوپێکەوتنی حاجی محەمەد قادر عەزیز، زەڕایەن، 10/ 6/ 2020.

موختارەکانیش بریتی بوون لە: محەمەد مستەفا وسەین، مستەفا حسێن ـ سەفای وسەین ، عەلی فەتاح مستەفا، (هۆزی هەسەن)، عەزیزی ئەحمەد و غەفوری عەزیز و مەلا مەحمودی غەفور (خێڵی ڕەحیم)، حەمە ساڵح و حاجی مەلا محەمەد (خێڵی حمەوەیس)[44]، مەلا محەمەدی شەل (خێڵی خەلیفە)، ئەمەش جۆرێک لە دەستاودەستی نوێنەرایەتی دەردەخات، جیاواز لە میراتگری خێڵایەتی کە لەسەر سیستمی پشتاوپشت دامەزراوە، ئەوەی جێگەی سەرنجیشە هیچ کام لەو کوێخایانە بەهۆی پێگەکانیانەوە دەوڵەمەند نەبوون و سەرجەمیان ژیانێکی ئاسایی وەک خەڵکی ئاواییەکەیان هەبووە[45].

موختارەکان دەم سپی و هۆکاری پەیوەندی نێوان خەڵک و حکومەت بوون، خەڵک بۆ میوانی ڕووی لێ ناون یان بۆ نێوانگری، دیارترین و ماوەدرێژترین موختارەکانیش غەفوری عەزیز بووە[46] کە لە سەردەمی پاشایەتیدا موختار بووە تا کۆتایی ئەم قۆناغە (1958) [47]، هەروەها بە کەسێکی چاکەخوازی سەرکردە و کارهەڵسوڕێنەر یاد و باسی هەیە، لە زۆر بۆنە و کاتیشدا بەتەنگی خەڵکی

---

(44) چاوپێکەوتنی باوا ساڵح ئەحمەد نادر، زەڕایەن، 5/ 6/ 2020؛ ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو ؛ محەمەد قادر، سەرچاوەی پێشو؛ چاوپێکەوتنی عەزیز ئەحمەد عەزیز، زەڕایەن 3/ 7/ 2020.

(45) فەتاح محەمەد (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

(46) عەزیز بەلەسۆیی، سەرچاوەی پێشوو؛ محەمەد قادر (خاسێ)، سەرچاوەی پێشوو.

(47) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

ئاواییەکەوە هاتووە و میوانداریی ڕێبوارانی کردووە و هەوڵیداوە ئاسانکاریی بۆ خەڵک بکات[48].

خاوەندارێتی گلێجاڵ بۆ بەشی زۆری زەوییەکانیان حاڵەتێکی تایبەت نییە لەسەر ئاستی کوردستان، چونکە سەرچاوەکان ئەوە دەخەنەڕوو لە هەندێک گونددا لە پەنا دەسەڵاتی شێخ و دەرەبەگەکاندا، وردە جوتیار و موڵکداری زۆری سەربەخۆ هەبوون، کە ساڵانە تەخمینی خۆیان داوە و نیوەکاری هیچ یەکێک لەو دوو دەسەڵاتە نەبوون [49].

**بەمۆ وەك ناونیشانی نوێ**

لە سەردەمی پاشایەتی و دواتریش کۆماریدا، گوندی گلێجاڵ بە بەراورد بە گوندەکانی تری دەوروبەری لە ژمارەی دانیشتوان و ڕووبەری زەوییەکانیدا گەورەتربووە، لە دوای ڕاپەڕین (1991) لە پێشەنگی ئەو گوندانە بووە کە بە قەرەباڵغییەکی زۆر ئاوەدان بووەتەوە، سەرەتای هاوینی هەمان ساڵ دەیان خێزانی ئاواییەکە کە لە ئۆردوگاکانی ئێران گەڕاونەتەوە و لە دەشتی گلێجاڵ لەناو کەپر نیشتەجێ بوون ، دواتر وردە وردە بە کۆمەکی ڕێکخراوە مرۆییەکان ئاواییان دروستکردووەتەوە [50]. لە کۆتاییەکانی ساڵانی نەوەدەکان،

---

(48) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو ؛ عەزیز ئەحمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو.

(49) جعفر خياط، القرية العراقية، دراسة في أحوالها و إصلاحها، المجمع العلمي العراقي، 1950، ص 53.

(50) جعفر خياط، القرية العراقية، ص 53.

ئەم گوندە پەرەسەندنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە بەهۆی ئەوەی کرایە مەڵبەندی ناحیەیەک بەناوی بەمۆ [51].
بەناحیەبوون، گوندەکەی بردە قۆناغی شارەدێ و بوو بەهۆکاری ئەوەی بە قەربالغی بمێنێتەوە. هەر لەم قۆناغەشدا گلێجاڵ بووە هەڵگری ناوی شاخی بەمۆ لەکاتێکدا گلێجاڵ خۆی لە دامێنی چیای خۆشکی ی دەستەخوشکی بەمۆدایە.
شاخی بەمۆ دیارترین سیمای سروشتییە لە ناوچەکە و ناونیشانێکی هاوبەشە بۆ ئەو کۆمەڵە گوندەی کەوتوونەتە پشت ئەم چیایەوە، ، ئەم زنجیرە شاخەش سنوری جیاکەرەوەی ناوچەکانی دەوروبەری هەڵەبجە و ناوچەکانی سەر بە قەزای خانەقینە، هەندێ گێڕانەوە و بیروباوەڕی کۆنیش ئاماژە بەوە دەکەن لەسەر چیاکە تەرمی پیرخدری شاهۆ ئەسپەردە کراوە کە باوەڕ وەهایە باپیرانی ساداتی تاوگۆزی و بنەماڵەکانی جاف بێت[52] ، بەڵام ئەم قسەیە پاڵپشتییەکی بەهێزی نییە، گرنگی بەمۆش تەنها لە بەرزی و زنجیرەییەکەیدایە (بەرزترین لوتکەی 1842مەترە) کە لە هەردوو دیوەوە و لە هەردوو بەری باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان کۆمەڵێک گوند بەیەکترەوە دەبەستێتەوە و لەبەر گرنگیی ئەم شاخەش وەک جێگەیەکی ستراتیجی سەرسنوری ئێران لە نەخشەیەکی سەربازیی عوسمانیدا

---

(51) سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران ( 4/ 11/ 1999)، بڕیاری ژمارە 280 بە ئیمزای کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی (ئیدارەی سلێمانی).
(52) سیسیل جۆن ئیدمۆندیز: کورد تورک عەرەب، وەرگێڕانی: حامید گەوهەری، دەزگای ئاراس، 2004، لا 112 و 202.

(1915) گرنگیی پێدراوە[53] ، زۆر گێڕانەوەیتری مێژوویی هەن لەسەر ئەوەی لەسەردەمی هاتنی ڕووسەکاندا بۆ ئێران پەناگەی هۆزەکانی ڕۆژهەڵات  بووە.

---

(53) نەخشەکە لە چاپخانەی ئەرکانی گشتی جەنگی عوسمانی، ساڵی ١٩١٥، چاپ کراوەو مەبەست لێی دیاریکردنی ئامانجە سەربازییەکان بووە، وێنەیەکیشی لە ئەرشیفی د. جەبار قادر هەیە.

**ژیانی ئاینی و تەریقەت و حوجرە و مەلاکان**

لە گڵێجاڵدا ئاینپەروەریی و ئایینداری سیما و مۆرکی زاڵی گوندەکە بووە ئیتر چ ئاینداری سۆفیگەری و تەریقەت بێت یان "ئیسلامی کۆمەڵایەتی" و خۆڕسک و حوجرەیی. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چالاکییە ئاینییەکانی ناو ئاوایی و گوندەکانی تری دەوروپشت.

یەکەم خانەقای شێخانی نەقشبەندی هەورامان، بەر لە دروستکردنی خانەقای بیارە، لە گوندی (گمە)ی دراوسێی گڵێجاڵ، لە دەوروبەری ساڵی (1890ز) لەلایەن شێخ عومەری زیائەدینەوە دروستکراوە[54]، شێخانی نەقشبەندی بەردەوام سەردانی ئەم خانەقایان کردووە[55]، شێخ نەجمەدینی شێخ عومەر زۆری ژیانی لە پشتە و گمە و پشتکێوی بەمۆ بەسەر بردووە[56]، لە پاش شێخ نەجمەدینیش شێخ عەلائەدین پێی لە گمە نەبڕیوە[57]، دواتر شێخ ساحێبی شێخ نەجمەدینی لە 1952ز، لە پشتە نیشتەجێ بووە، خانەقای خۆی ئاوەدان کردووەتەوە تا ڕاگواستنی 1978ز[58].

---

(54) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1970، 2/ 161؛ شێخ مەحمود شێخ صاحب، کوانوی خەبات، تاران، 2020، (پێشەکی)، لا 14_15.

(55) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان161/2؛ شێخ مەحمود، سەرچاوەی پێشوو، لا 14_15.

(56) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان ، 2/ 284_ 287.

(57) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ڕۆژگاری ژیان 129.

(58) مەحمود نەقشبەندی، سەرچاوەی پێشوو، لا 14_15.

شێخەکان لەگەڵ هاتنیاندا بۆ ناوچەکە پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ زۆربەی خەڵکی گڵێجاڵدا دروستکردووە و مورید بەیعەتیان پێداون[59]، سۆفی عەزەمی باپیر (1942 مردووە) یەک لە ناودارترین سۆفییەکانی شێخ نەجمەدینی شێخ عومەر بووە لە ئاواییەکە و ناوبانگی لە سنوری گڵێجاڵ دەرچووە، چیرۆک و گێڕانەوە لەسەر زوهد و پابەندیی ئەم سۆفییە بەربڵاوە[60]. جگە لە ئەویش لە گڵێجاڵ مورید و مەنسوبی شێخانی نەقشبەندی بڵاوبوون و ناوبەناو هاتوچۆی خانەقاکانی گمە و پشتە و بیارەیان کردووە، لەوانەش عەبدوڵڵای وسەین و عەبدوڵڵای ئەحمەد و یوسفی حەمە چەرمەڵ و کاکە هەسەنی دۆعاگۆ کە وەها باوە نزای هەمیشە قبوڵ بووەو ... هتد[61].

هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا بەهۆی شێخانی قادریی ناوچەی سەلاسی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە، تەریقەتی قادری لە گڵێجاڵ جۆرێک لە ئامادەیی هەبووە، خەلیفە مارف، دۆستایەتی و تێکەڵیی لەگەڵ شێخانی ڕۆژهەڵات هەبووە و خەلیفەی شێخ ڕەسوڵی خانەشوور بووە، ئەوەش بڵاوە لە گڵێجاڵ تەکیەی هەبووە[62]، لە پەنا ئەم دوو تەریقەتەشدا چەند مەلایەک و بەدوایاندا کۆمەڵێک فەقێ و مەلای خوار

---

(59) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

(60) حەمەعەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو .

(61) چاوپێکەوتنی خاسێ حەسەن، زەڕایەن، 9/ 6/ 2020؛ چاوپێکەوتنی مریەم فەتحوڵڵا یوسف، زەڕایەن، 7/ 6/ 2020.

(62) عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ مەحمود عەلی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

ئاستی "12 عیلم" لە گلێجاڵ دەرکەوتوون کە دەکرێت بوترێت مسوڵمانی حوجرەیی بوون، ڕۆڵ و کاریگەریی مەلاکانیش لە دوای ساڵی (1945ز) بەشێوەیەکی زەقتر لە جاران پەرەی سەندووە، چونکە مزگەوت لە گلێجاڵ دروستکراوە و بەدوایدا حوجرە بۆ پێگەیاندن و خوێندن و حەواندنەوەی فەقێیان [63].

مەلاکان وەک چاکەخوازی کۆمەڵایەتی و پیاوماقووڵ و دادوەری شەرعی لە ئاواییەکە و لە پشتکێوی بەمۆ ڕۆڵیان بینیوە، کۆتا مەلای ئەم زنجیرەیەش مەلا سەعیدە (مامۆستا)، کە سەرەڕای ئەرکە ئاینییەکانی مەلایەتی بەهاوکاریی پیاوماقووڵان ئەرکی چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانی خێزانەکان و ناکۆکییەکانی پەیوەست بە زەوی و زار و مامەڵەی ڕۆژانەی خەڵکی هەڵسوڕاندووە، هاتوچۆی لەگەڵ گوندەکانی دەوروبەریش هەبووە[64] هەفتانە چ خۆی بە تەنها یان لەگەڵ فەقێکانی سەردانی گوندەکانی کردووە بۆ ڕێنمایی ئاینی [65].

مەلا و فەقێکانی گلێجاڵ لە ڕەمەزانان و مانگەکانی تردا بە زۆر ئاوایی تردا بڵاوبونەتەوە بۆ بانگدان و سەڵاکردن و خوێندنەوەی مەوعیزەی ڕەمەزانان[66]، لە گوندەکانی

---

(63) حەمەعەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

(64) مەلا عەبدوڵڵا حمە حەمەوەیس، سەرچاوەی پێشوو.

(65) چاوپێکەوتنی مەلا محەمەد مەلا سەعید، زەڕایەن،10/ 6/ 2020.

(66) لە بەشی کۆتایی ژیاننامەی مەلاکاندا ئاماژە بەو گوندانە هەیە.

دەوروبەرەوە، خەڵک هاتوون بۆ بەشداریکردنی نوێژی هەینی گڵێجاڵ، هەندێ لە ژنانی بەتەمەنی گڵێجاڵیش لە حوجرەکەدا بەشداریی جومعەیان کردووە[67].
لە گڵێجاڵ یادەکانی مەولود بەرز ڕاگیراوە و ئاهەنگی تایبەتی بۆ سازکراوە، ئەم نەریتەش تا کۆتایی هەشتاکان لە هەندێک لە خێزانەکانی ئەم گوندە پارێزگاریی لێکراوە، لەوانەش ماڵی حاجی تۆفیقی مام فەتحە و لەسەر کاسێت تۆمار کراون، لە بیرەوەری ژیانی گوندەکەشدا ئەوانەی چوون بۆ بەجێهێنانی حەج بە دەف و دایرە و سەڵاواتدان لە دووری ئاوایی بەڕێکراون و پێشوازی کراون[68]، هەندێک لە پیاوانی گوندەکەش موناجاتی ئاینییان هەیە، لەوانەش؛ حاجی عەزیزی مام ئەمین [69]، لەپاش راگواستنی (1978) یش ژمارەیەکی زۆری خەڵکی گڵێجاڵیش بەکۆمەڵ فەرزی حەجیان بەجێهێناوە و بوونەتە هەڵگری نازناوی حاجی[70].

---

(67) مەلا عەبدوللای حەمە حەمەوەیس، سەرچاوەی پێشوو ؛ مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.
(68) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو.
(69) لاوانەوەو موناجاتەکە لەسەر کاسێتی تەسجیل تۆمارکراوە و بڵاویش کراوەتەوە: https://bit.ly/2ERkTvf
(70) وێنە و یادگاری حاجییەکان لەبەشێک لە ماڵەکاندا تا ئێستاش پارێزراون.

# مەلاکانی گڵێجاڵ

**ـ مەلا یوسف (گەورە)**

کوڕی خەلیفە مارفە، لەپاش (1850 ز) ژیاوە، زانیاریی لەبارەی خوێندن و پێگەیشتنی لەبەردەستدا نییە، بەڵام مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس وەک مەلا ناوی هێناوە[71]، لە سەردەمی خۆیدا لە گڵێجاڵ هەندێک فەقێی هەبووە لەوانەش مەلا فەتاحی برای، خەلیفە ئەحمەدی کوڕی و رابیعەی کچی[72] فەتوایەکیشی دەربارەی پێویستیی دەرکردنی زەکات لە قەرەخەرمان بڵاوە[73]. هاوژینەکەی (مەلەکێ عەزیز) عەشیرەتی قوبادییە[74]، خۆیشی زیاتر لەناوچەی سەلاسی باوەجانی ناسراو بووە وەک مەلایەکی دیندار[75]، باوەڕ وەهایە لەدەوروبەری (1925) کۆچی دوایی کردبێت و بەمەلا یوسفی گەورەش ناسراوە بۆ جیاکردنەوەی لە مەلا یوسفی کوڕەزای کە هاوناوە.

---

(71) رۆژگاری ژیان، لا 199.

(72) فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(73) بەپێی نەریتی جوتیارەکان زەکاتی بەروبووم و دانەوێڵە لەپاش دروێنە دەردەکرێت، بەڵام بەپێی ئەو گێڕانەوە دەماودەمانەی لەگڵێجاڵدا هەیە، مەلا یوسف رەخنەی لە خەلیفە مارفی باوکی گرتووە کە قەرەخەرمان دەکات و دەیخوات لەکاتێکدا بەسەوزی دروێنە کراوە و هێشتا نەبووەتە دان و زەکاتی لێ دەرنەکراوە، ئەمەش بۆچوونی هەندێ لە شەرعزانەکانی ئیسلامە کە پێیانوایە دەبێت لەگەڵ گەنمەکە ئەژمار بکرێت بۆ زەکات. بڕوانە: د. سائد حسني دراغمة (14/ 4/ 2019)، هل في الفريكة زكاة، https://www.youtube.com/watch?v=BZ4mLk0XGlg.

(74) فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(75) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

**مەلا محەمەدی ئەسپەری**

باپیری خێڵی مەلایە کە یەکێکن لە پێکهاتەکانی گڵێجاڵ، بەپێی ناوەندی تەمەنی نەوەکانی، دەبێت لە دەوروبەری ساڵانی 1850ز بەدواوە ژیابێت، بەپێی ئەو گێڕانەوانەشی لەبارەی باپیرانییەوە هەن لە گوندی ئەسپەری ناوچەی سەلاسی نزیک لە گڵێجاڵەوە هاتوون [76]، بەهۆی گرانی و قات و قڕی ناوچەی خۆیان بەجێهێشتووە و لە گلێجاڵ گیرساونەتەوە [77]، لەدوای ئەمەش دەوروبەری کانیاوی سماقەیان کردووە بە باخ و تەڕەکاڵ[78].

مەلا محەمەد، هەتا کۆچی کردووە مەلایەتی کردووە، مۆڵەتی مەلایەتی "12 عیلم" ی هەبووە، ئەگەرچی لە گڵێجاڵدا ئەوکات مزگەوت نەبووە، بەڵام ئەم جێگەی پرسی خەڵک بووە[79]، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ تەریقەتی نەقشبەندی و شێخانی بیارە هەبووە، دەگێڕنەوە جارێک شێخ عەلائەدینی زیائەدین هاتووەتە گڵێجاڵ، لە نەزرگەی دەسپێکی ئاوایی لە وڵاغەکەی دابەزیوە، کە لێیان پرسیوە بۆچی؟ وتویەتی: چۆن دانابەزم مەلا محەمەدی ئەسپەری دێت بە پیریمەوە[80].

---

(76) چاوپێکەوتنی عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا، زەڕایەن، 25/5/ 2020.

(77) سەرچاوەی پێشوو.

(78) فەتاح محەمەد (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

(79) چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی عەبدولڕەحیم عەزیز، زەڕایەن، 23/ 6/ 2020 ؛ عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

(80) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

هاوژینەکەی ناوی (خۆرشە) بووە، بەپێی ئاماژەکان مەلا محەمەد لەکۆتایی بیستەکان کۆچی دواییکردووە، لە گۆڕستانی ئیمام محەمەدی گلێجاڵ ئەسپەردە کراوە کە گۆڕی زۆربەی پیاوە دێرینەکانی گلێجاڵ لەخۆ دەگرێت.

**مەلا فەتاحی خەلیفە**

مەلا فەتاح کوڕی خەلیفە مارفە، بەپێی ئاماژەکان، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ژیاوە، لە زۆر شوێن فەقێیەتی کردووە لەوانەش حوجرەی گوندی پریس لە دەڤەری هەڵەبجە [81]، لەگەڵ گەڕانەوەیدا بۆ گلێجاڵ کاری مەلایەتی کردووە و داوەریی خەڵکی کردووە و ژنی بۆ خەڵک مارە بڕیوە و حوجرەی فەقێی هەبووە[82]، وەها بڵاوە لە گلێجاڵ کە مەلا فەتاح جگە لە مەلایەتی خۆی کاری جوتیاریی و کشتوکاڵی خۆی کردووە[83]. بەپێی ئاسەوارەکانی خاوەن دەستوخەتێکی جوان بووە و لەو کەشکۆڵەی زانستە شەرعییەکان کە نووسیبوی ناوی "فەتاح خەلیفە زادە"ی بەکارهێناوە [84]، هەروەها وانەی بە کۆمەڵێک فەقێ وتووە و حوجرەی هەبووە لە گلێجاڵ[85]، کە دواتر ئاماژە بە هەندێکیان دەکرێت و لە ساڵانی سییەکان کۆچی دوایی کردووە.

---

(81) مەلا عومەر عەبدولعەزیز الحسیني، نامەیەک بۆ برایانی عەشیرەتی گلێجاڵ، 23 / 10/ 2003 "دەستخەت"

(82) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(83) مەلا عومەر عەبدولعەزیز الحسیني، نامەیەک.. هەمان سەرچاوە.

**مەلا یوسفی گڵێجاڵی**

مەلا یوسف کوڕی خەلیفەی ئەحمەدی مەلا یوسفی گەورەیە، دەوروبەری ساڵی 1915 لەدایکبووە، باوکی خوێنەواریی هەبووە و قورئان خوێنێکی ڕەوانبێژ بووە[86].

مەلا یوسف سەرەتا لای مەلا فەتاحی مامی لە گڵێجاڵ و لە زۆر حوجرەی تری کوردستان لە ساڵانی سییەکان و نیوەی یەکەمی چلەکانی سەدەی رابردوو خوێندوویەتی لەوانەش: ناو شاری هەڵەبجە[87]، گوندی چنار[88]، عەبابەیلێ[89]، فەقێ جنە[90]، پێنجوێن [91]، تەوێڵە[92]، پریس[93]، گێڵدەرەی شارباژێڕ[94] هەروەها باسی ئەوەش هەیە چووبێتە شاری سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و مزگەوتی شێخی گەیلانی لە

---

(84) مەلا عومەر عەبدولعەزیز الحسيني، نامەیەک.. هەمان سەرچاوە.

(85) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(86) مەلا عەبدوڵڵا حەمە حەمەوەیس، سەرچاوەی پێشوو

(87) چاوپێکەوتنی حەمە ی مەلا کەریم، سلێمانی 9/ 12/ 2006؛ سەرچاوەی پێشوو؛ مەلا عەلی کۆکۆیی، سەرچاوەی پێشوو؛حەمە تۆفیق دەروێش ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو.

(88) مەلا عەلی قادر کۆکۆیی، سەرچاوەی پێشوو.

(89) چاوپێکەوتن لەگەڵ حەمە ی مەلافەرەج، زەڕایەن، 23 تەمموزی 2008 ؛ باوا ساڵح ئەحمەد نادر، سەرچاوەی پێشوو.

(90) چاوپێکەوتنی زینەت ئەحمەد یوسف، هەڵەبجەی تازە، 24 تەمموزی 2008.

(91) چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا سەید ئەحمەد تاوگۆزی، 16 حوزەیرانی 2005.

(92) حەمە ی مەلا کەریم، سەرچاوەی پێشوو "چاوپێکەوتن".

(93) مەلا عومەر عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو، "نامە".

(94) چاوپێکەوتنی تەها محەمەد، زەڕایەن، 2020/5/15.

بەغدا[95]، لە کۆتا وێستگەی فەقێیەتیشدا لە سەردەستی کەسایەتی و زانای ناسراوی دەڤەری هەڵەبجە مەلا ساڵحی گەورە، لە گوندی تریفە لە ساڵی (1945ز) مۆڵەتی مەلایەتی وەرگرتووە[96].

مەلا یوسف هاوفەقێ و هاوڕێی مەلا مەجیدی دەوڵەتئاوای جوانڕۆ بووە[97] ، جگە لە شەرعزانی، شارەزایی و ڕۆشنبیری گشتی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان هەبووە[98]، خاوەن بۆچوونی تایبەتی خۆی و کەسێکی چاوکراوە و زیرەک بووە[99]، وەک مەلا مەحمودی گەلاڵەی بەڕێوەبەری پێشووی کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانیش ئاماژەی پێکردووە، لە دەمی خۆیدا کاریگەر بووە بە بەرهەمی ڕێبەرە منەوەرە چاکسازیخوازە ئیسلامییەکانی قوتابخانەی میسری وەکو ڕەشید ڕەزا و محەمەد عەبدە[100]، چەند مانگێک لە پاش مۆڵەت وەرگرتنی و لە دەمی گەڕانەوەیدا بۆ گڵێجاڵ بە میوانی لەلایەن خزمەتکاری ماڵی شێخ زاهیدی شێخ عەلادینی نەقشبەندییەوە بەناوی حەمە چەتە لە هاوینی (1946 ز)

---

(95) بەرزان ئەحمەد، مەلا یوسف چۆن لەلایەن شێخێکی هەورامانەوە تیرۆر کرا؟!، گۆڤاری (ستاندەر) ژمارە (25)، حوزەیرانی 2008، لا 14_19.

(96) چاوپێکەوتنی مەلا جەلال مەلا ساڵحی گەورە، سلێمانی، 5 /6/ 2020.

(97) حەمە تۆفیق دەروێش ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو.

(98) مەلا جەلالی مەلا ساڵحی گەورە، سەرچاوەی پێشوو.

(99) حەمە ی مەلا کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

(100) ئاراس محەمەد ساڵح، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە کۆمەڵە دیدارێکی ڕۆژنامەنووسیدا، سەنتەری زەهاوی، 2015، لا 35.

کوژراوە، پاشان لە هەڵەبجە ئەسپەردە کراوە [101]، لەپاش خۆی هەندێ دەستخەت و فۆتۆیەکی لێ بەجێماوە و لەبەر ئەوەی هاوسەرگیریی نەکردبوو هیچ نەوەیەکی نییە، تێکڕای ئەم بەسەرهاتەش لەسەر زاری خەڵک بە "ساڵی هەراکە" بەناوبانگە کە لەبەشی دواتردا دێینە سەری.

**ـ مەلا سەعید (مامۆستا)**

کوڕی مستەفای خەلیفە مارفە، لە ساڵی (1910ز) لە ئاوایی گڵێجاڵ لەدایکبووە. لە تەمەنی منالّیدا باوک و دایکیشی کۆچی دواییان کردووە، سەرەتا خوێندنی حوجرەی لای مەلا فەتاحی مامی دەستپێکردووە[102]، لە پاش ئەوەی مامی کۆچی دوایی کردووە، بەرەو مەدرەسەکانی هەڵەبجە و هەورامان ڕێگای گرتووەتە بەر[103]. لە قۆناغی "تصریف الزنجاني" بووە، ڕوویکردۆتە مەدرەسەی بیارە، لەو ماوەیەشی لەوێ بووە، هەندێ کات لە حوجرە و مەدرەسەی تر خوێندوویەتی وەک مەدرەسەی گوندی پریس لای مەلا عەبدولعەزیز لە ناوچەی نەورۆڵی[104]، ماوەیەکیش ڕۆشتووە بۆ گوندی بال ـ ـ ک لە مەریوانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەبەردەستی مەلا باقری بالەک شەش مانگ

---

(101) بەرزان ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو، لا 14_19.

(102) مریەم فەتحوللا، سەرچاوەی پێشوو.

(103) مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.

(104) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ڕۆژگاری ژیان، ل199؛ مەلا عومەر عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو.

فەقێ بووە[105]، هەروەها ماوەیەکیش لە مەدرەسەی تریفە خوێندوویەتی[106].

لە ساڵی (1364 ک/ 1945ز) مۆڵەتنامەی مەلایەتی "الإجازة العلمية" ی لە بیارە لەسەردەستی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس وەرگرتووە، هەر ئەویش بە "مەلایەکی خاوەن ئاکاری باش" باسی کردووە[107]. هەر ئەو ساڵەش گەڕاوەتەوە بۆ ئاوایی گڵێجاڵ لە پشتکێوی بەمۆ و نوێژی هەینی دامەزراندووە، لە بناری بەمۆ بە نازناوی "مامۆستا" ناسراوە بەوپێیەی ساڵانێکی زۆر مودەڕیس و مامۆستای بابەتە شەرعییەکان بووە، ماوەیەکیش لە گوندی هۆرێن مەلایەتی کردووە[108]، بەڵام لەو دەستخەتانەی لێی بەجێماوە خۆی نازناوی "هەژار"ی بۆخۆی بەکارهێناوە[109].

مەلا سەعید سێ جار هاوسەرگیری کردووە، یەکێک لە هاوسەرەکانی لە ساداتی تاوگۆزی نەوەی مەولەوییە (فاتمەخان). لە پاش ڕاگواستنی گوندەکانی بناری بەمۆ بۆ ئۆردوگای زەڕایەن (1978)، سەردەمێک وتاربێژی مزگەوتی گەورەی شارۆچکەکە بووە، لە ساڵانی کۆتایی

---

(105) مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.

(106) مەلا جەلال مەلا ساڵحی گەورە، سەرچاوەی پێشوو.

(107) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ڕۆژگاری ژیان، 199.

(108) مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو ؛ باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(109) هەندێک لەو دەستخەتانەی لە ناوەندی کوردستان، زانکۆی سلێمانی ئەرشیفکراوە (هاتوو1/ 52).

تەمەنیدا بەهۆی جەڵتەوە باری تەندروستی تێکچووە و کەوتووەتە سەرجێگا، لە ڕۆژی 27ی ئایاری (1988ز) کۆچی دوایی کردووە، گۆڕەکەی لە گۆڕستانی گشتیی شارۆچکەی زەڕایەن (وارماوا)یە [110].

## مەلا مەحمود گڵێجاڵی

مەلا مەحمود کوڕی مەلا فەرەجە و لەبنەماڵەی مەلا محەمەدی ئەسپەرییە، لە دەوروبەری ساڵی 1920ز لە ئاوایی گڵێجاڵ لەدایکبووە، باوکیشی هەر پێی وتراوە مەلا[111]، بەڵام خۆی هەڵگری نازناوی "گڵێجاڵی" بووە[112]، سەرەتای خوێندنی حوجرەی لای مەلا فەتاحی خەلیفە بووە لە گڵێجاڵ[113]، دواتر زۆر شوێن گەڕاوە لەوانەش شاری هەڵەبجە و لەوێ لە مزگەوتی تەکیە ماوەیەک لەگەڵ مەلا یوسف لای مەلا محەمەدی عەبابەیلێی خوێندوویانە [114]، سەردەمێکیش لە مزگەوتی بن تەبەقی عیرفانی سلێمانی بووە [115]، هەروەها چووەتە گوندەکانی قاینەیجەی شارەزوور، باوەخۆشێنی نزیک دەربەندیخان، بێلولە و

---

(110) مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.

(111) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو

(112) حاشیەی دەستخەتەکانی کتێبەکانی فەقێیەتی مەلا مەحمود، ناوەندی کوردستان ـ زانکۆی سلێمانی.

(113) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(114) حەمە تۆفیق دەروێش ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو.

(115) پەراوێزی دەستخەتی عەوامیل و کتێبەکانی فەقێیەتی، وێنەی لە ناوەندی کوردستان، زانکۆی سلێمانی هەیە.

تەکیەی قەرەداغ[116]، دواتر پاوە، بیارە، جوانڕۆ، گەڕاوە، پاشان لەسەر دەستی مەلا شێخ عەبدولوەهاب مۆڵەتی مەلایەتی وەرگرتووە لە ئاوایی نێرگزەجاڕ [117]. لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لە (1961ز) وەک کادرێک بەشداریی کردووە لە بناری بەمۆ و بوەتە بەرپرسی ناوچە، یەکێک بووە لە پەیڕەوانی تەریقەتی نەقشبەندی[118]، هەندێ دەستخەتی مەلایەتی لێ بەجێماوە کە ئاماژەن لەسەر ئەوەی لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی شارەزایی هەبووە، هەندێ وانەی فەقێیەتیشی بۆ مەلا مەحمودی غەفور نووسیووەتەوە[119].

جگە لە خوێندی مەلایەتی، مەلا مەحمود کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی بووە، شارەزای دابونەریت و ڕابردووی ئاواییەکە بووە، خەڵک بۆ پرس و زانیاری وەرگرتن گەڕاونەتەوە سەری و کەڵکیان لە زانیاری و لێکدانەوەکانی وەرگرتووە[120]. وەک ژیانی تایبەتیش کوڕێکی تاقانەی

---

(116) حاشیەی دەستخەتەکانی کتێبەکانی فەقێیەتی مەلا مەحمود، ناوەندی کوردستان - زانکۆی سلێمانی.

(117) هەندێ لە دەستخەتەکانی سەردەمی فەقێیەتی مەلا حمود، ئەرشیفی بنەماڵە؛ پۆرتاڵی ڕووداو (13/ 5/ 2020)، ژیاننامەی مەلامەحموود گڵێجاڵی، https://www.facebook.com/watch/?v=543052049688287 (بەردەستە: 29 / 6/ 2020).

(118) سەرچاوەی پێشوو.

(119) حاشیەی دەستخەتەکانی کتێبەکانی فەقێیەتی مەلا مەحمود، ناوەندی کوردستان - زانکۆی سلێمانی.

(120) مەلا محەمەدی مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.

هەبووە هەر بە منداڵی کۆچی دوایی کردووە، چوار کچیشی لە پاش بەجێماوە، لە ساڵی (2005ز) لە شارۆچکەی زەڕایەن کۆچی دوایی کردووە و  هەر لەوێ بەخاک سپێردراوە[121].

## حوجرەی گلێجاڵ

مێژووی خوێندنی حوجرە لە گلێجاڵ دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم کە مەلا فەتاحی خەلیفە مارف مامۆستای بووە، شوێنی حوجرەکە لەجێگەی ئێستای مزگەوتی کۆنی ئاواییەکە بووە، هەندێکجاریش دەوروبەری (10) فەقێی تێدابووە کە هەندێکیان لە سەلاسی باوەجانی و ناوچەی تاوگۆزی ئێرانەوە هاتوون[122]، جگە لەو مەلایانەی ئاماژەیان پێکرا (مەلا یوسف، مەلا سەعید، مەلا مەحمود)، هەندێکیتر لەوانەی لەگلێجاڵ لای مەلا فەتاح خوێندوویانە و زانیاری لەبارەیانەوە بەردەستە ئەمانەی خوارەوەن:

### مەلا محەمەد نادر

ناوی تەواوی مەلا محەمەد نادر قادرە، لە هۆزی هەسەنە، سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، لەبەردەستی مەلا فەتاحی خەلیفە لە گلێجاڵ قورئان و وردە کتێبەکانی زمانی عەرەبی و شەرعزانیی خوێندووە، لەپاش هاوسەرگیریکردن (رەیحان)، چووەتە گوندی کەوزەیناڵی و لەوێ مەلایەتی بۆ

(121) هەمان سەرچاوە.

(122) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

کردوون، پاشان چووەتە گوندی (دەکە) و  لە کۆتایی پەنجاکان کۆچی دوایی کردووە. کوڕ و کچێکی هەبووە، کوڕەکەی (عوسمان) لە هەرزەکاریدا ژیانئاوایی کردووە، کچەکەشی (مینا) لە دەربەندیخان گیرساوەتەوە[123].

**مەلا محەمەد مەحمود**

کوڕی مەحمودی محەمەدە، لەدایکبووی سالآنی بیستەکان بەدواوەیە، بەهۆی گیرانی بۆ خزمەتی سەربازیی لەسەردەمی پاشایەتی وازی لە فەقێیەتی و خوێندنی حوجرە هێناوە[124]. قورئانخوێن و بانگبێژ بووە تا کۆتایی ژیانی و بە "مامۆ مەلا" ناسراوە، لە دوای (2010) لە شارۆچکەی زەڕایەن کۆچی دواییکردوە.

**کەریمی ساڵح**

لەدایکبووی ساڵی (1905)ـە، ماوەیەک فەقێیەتی کردووە لە حوجرەی گلێجاڵ، هەندێک یادەوەری و بەسەرهاتی لەگەڵ مەلا فەتاحدا بۆ نەوەکانی گێڕاوەتەوە، لە سەعداوا ناوبەناو کاری بانگبێژیی کردووە و لە (1979 ز) لە زەڕایەن کۆچی دوایی کردووە[125].

---

(123) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو؛ باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(124) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(125) عەبدولڕەحمانی فەتحوڵلا، سەرچاوەی پێشوو؛ چاوپێکەوتنی تۆفیق کەریم، هەڵەبجە، 25/ 7/ 2020.

## دروستکردنی مزگەوت و دەستپێکردنەوەی حوجرە

لە پاش کۆچی دوایی مەلا فەتاح لەسالآنی 1930 ماوەیەک حوجرەی گلێجاڵ وەستاوە، مەلا سەعید کە فەقێی بووە چووەتە بیارە، مەلا یوسف بۆ هەڵەبجە، مەلا محەمەدی نادر بۆ شێخان، مەلا محەمەد مەحمود بۆ سەربازیی، مەلا مەحمود بۆ قەرەداغ، کەریمیساڵحیش دابڕاوە[126]، بەڵام لە ساڵی (1945) کە مەلا سەعید و مەلا یوسف مۆڵەتی مەلایەتی "الإجازة العلمية" یان وەرگرتووە، کەپر و جێگا لە دەشتی گلێجاڵ ئامادەکراون بۆ کردنەوەی مەدرەسەی ئاینی تا پێشوازی لە فەقێ بکات لە گوندەکانی دەوروبەرەوە، بەڵام هەرای کوشتنی مەلا یوسف و تاڵانکردنی گلێجاڵ دوای خستووە و تێکیداوە [127]، لە پاش هێوربوونەوەی ئەو دۆخە، مزگەوت و لە پەنا ئەوەشدا حوجرە لەسەر بەرزاییەکی ناوەڕاستی گوندەکە (کەوەلەکە) دروستکراوەتەوە، کە پێش لەوەی ببێتە مزگەوت هەر حوجرە بووە، پاشان بووەتە شوێنی کۆبوونەوەی ئێواران و دەمەتەقێ و یەکتر بینینی پیاوانی ئاوایی[128].

---

(126) مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ مریەم فەتحوڵلا، سەرچاوەی پێشوو.

(127) مریەم فەتحوڵلا، سەرچاوەی پێشوو.

(128) حەمە عەلی سەید محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ ئەمە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

مەلا سەعید بووەتە "مامۆستا"ی قۆناغی دووەمی حوجرەکە کە تایبەت بووە بە فێرکردنی زانستە شەرعییەکان و جگە لە فەقێی ئاواییەکە وەک جاران لە دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشەوە فەقێ لە قۆناغی جیاجیا ڕوویان تێکردووە(129)، تەنانەت سەردەمێک موستەعیدەکانی حوجرەی گڵێجاڵ خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ناوچەی سەلاس و دەوروبەری جوانڕۆ بوون. ئەم حوجرەیە بووەتە سەرچاوەی پێگەیاندنی مەلا بۆ بەشێک لە گوندەکانی تری بناری بەمۆ، بەتایبەت لە مانگەکانی ڕەمەزان کە پێویستیان بە بانگ و سەڵاکردن و ئامۆژگاریکردن هەبووە(130).

مزگەوت و حوجرەکە بوونەتە جێگای کۆبوونەوەی خەڵک و خوێندن و فێربوون، هەندێکیش لەبیریانە کە لەسەر کۆڵەکەی ناو مزگەوت هەندێ بەروار و یادەوەری تایبەت بە ڕووداوەکانی گڵێجاڵ نوسرابوون لەوانەش "ساڵی هەراکە" و کوشتنی مەلا یوسف و تا ساڵی ڕاگواستن بۆ زەڕایەن (1978) هەر مابوون(131)، ئەمەش لەکاتێکدا بووە کە خەڵک نەیانزانیوە بە دروستی ساڵنامە چییە و کات کەیە و لەبری ئەوە بە ڕووداوەکان کاتەکانیان جیا کردووەتەوە (132)

---

(129) مەلا عەبدوڵڵا حەمە حەمەویس ؛ حاجی محەمەد قادر عەزیز، سەرچاوەی پێشوو.

(130) مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو؛ مەلا عەبدوڵڵا حەمە حەمەوەیس.

(131) چاوپێکەوتنی مەحمود عەلی محەمەد، زەڕایەن، 5 / 6/ 2020.

(132) چاوپێکەوتنی عەزیز مەحمود محەمەد، 4/ 6/ 2015.

وەک"ساڵی هەراکە" و "ساڵی بەورە سوور" و" ساڵی هەرەسی کورد".

جگە لە قورئان، ئەو کتێبانەشی لە حوجرەی گڵێجاڵ خوێنراون زیاتر بریتی بوون لە: عەوامیلەکان (الجرجاني و البركوي)، ئونموزەج، تەسریفی مەلا عەلی و تەسریفی زنجانی... ئەمانەش سەرچاوە سەرەتاییەکانی فێربوونی ڕێزمانی عەرەبین وەک دەسپێک بۆ تێگەیشتن لە سەرچاوەکانی شەرعزانی[133].

سەرچاوەی کۆمەککردنی حوجرەی گڵێجاڵ خەڵکی ئاواییەکە بوون، کە نان و خۆراکیان بۆ فەقێ و غەریبەکان دابین دەکرد بەپێی دابونەریتێک کە پێی دەوترێت "ڕاتبەی فەقێ"[134]، بەم پێیەش فەقێکان دەگەڕان بۆ کۆکردنەوەی نان و بەروبووم و هەرکەس چێشت و خواردنێکیشی هەبوایە ئەینارد بۆیان و ئەمەیان بە ئەرکی خۆیان زانیوە، هەم وەک خێر و چاکەکردن، هەم وەک پاڵپشتی بەردەوامیی خوێندنیش لە حوجرەکە.

**مەلا و فەقێکانیتر**

لە حوجرەی گلێجاڵدا زۆر کەس خوێندوویانە، زۆرێک لەوانەش تا ئاستی جیاجیا ڕۆشتوون و دواتر وەک

---

(133) مەلا عەبدوڵڵا حەمە حەمەوەیس، سەرچاوەی پێشوو.

(134) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

قورئانخوێن و بانگبێژ بەردەوام بوون یان هەر وەک خوێنەوارێکی سەردەمی خۆیان ماونەتەوە، کە بەسەر دوو گرووپدا دابەش بوون کە فەقێی ئاواییەکە و میوانەکانی دەوروبەرن.

## فەقێ و مەلاکانی ئاوایی

### ـ مەلا محەمەد ئەحمەد (حاجی مەلا)

ساڵی 1935 لە گڵێجاڵ لەدایکبووە، سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی گڵێجاڵ دەستپێکردووە، لە 1955 گیراوە بۆ سەربازیی، لە 1956 بەپێی "قانون الإعالة" بەخشراوە لە سەربازی[135] و دەستی کردوەتەوە بە خوێندنی حوجرە لای مەلا سەعید تا وردە کتێبەکانی تەواوکردووە، پاشان بۆ درێژەدان بە خوێندن رویکردووەتە زۆرێک لە حوجرەکانی گەرمیان و هەڵەبجە و دەوروبەری سلێمانی لەوانەش؛ کوڵەجۆ، خانەقین، کەرکوک، پیرەمەگرون، عەبابەیلێ، تەوێڵە و بیارە، بەم هۆیەشەوە پەیوەندییەکی بەرفراوانی پەیدا کردووە، ماوەیەک لە گوندەکانی دەرەشیشی سەروو لەگەڵ تەپی سەفای نزیک ناحیەی سیروان لای مامۆستا شێخ عەبدولعەزیزی پاڕەزانی خوێندوویەتی. دووجار بووەتە کوێخای گڵێجاڵ لە ساڵانی شەستەکان و حەفتاکان، لە 1968 فەرزی حەجی بەجێهناوە و لەوە بەدوا بە "حاجی مەلا" ناسراوە. لە گوندەکانی دەوروبەری هەڵەبجە مەلایەتی کردووە بەتایبەت لەمانگەکانی رەمەزان، دواتر هەر لە

(135) پەڕاوی سەربازیی حاجی مەلا محەمەد "دفتر الخدمة".

هەڵەبجە نیشتەجێ بووە و سەرقاڵ بووە بە کاری کڕین و فرۆشتن و دوکانداریی، لە کۆتا رۆژی ساڵی 2016 کۆچی دوایی کردووە، لەبارەی ژیانی تایبەتییەوە سێ جار هاوسەرگیری کردووە کە یەکێکیان نەوەی مەولانا خالیدی نەقشبەندییە[136].

**- مەلا محەمەدی خەلیفە**

کوڕی خەلیفە ئەحمەد و برای مەلا یوسف و کوڕەزای مەلا یوسفی گەورەیە، دەوروبەری (1935) لەدایکبووە، لەحوجرەی گلێجاڵ قورئان و وردە کتێبەکانی خوێندووە، ماوەیەک لە جێگای مەلا سەعید وتاری جومعەی داوە، لە زەڕایەن بانگبێژ و و قورئانخوێن بووە تا خانەنشین بوونی، لە ساڵی (1996ز) کۆچی دوایی کردووە [137].

(136) چاوپێکەوتنی حاجی مەلا محەمەد، هەڵەبجە، 7/7/ 2005؛ نەجمەدین حاجی مەلا، هەڵەبجە، 2020/8/24.

(137) باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو ؛ هەندێ دەستخەتی مەلا محەمەد خۆی "ئەرشیفی بنەماڵە".

### مەلا مەجید ئەمین

کوڕی مام ئەمین ئەحمەدە، ساڵی (1938) لەدایکبووە، لەفەقێ سەرتەڵەکانی حوجرەی گڵێجاڵ بووە، لە گوندەکانی دەوروبەری گلێجاڵ (کانی پاشا) و گوندی دەسێردی ئێران مەلایەتی کردووە، لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی فەقێیەتی کردووە (1957ز) ، پاشان چووەتە هەڵەبجە و لای مەلا ساڵحی گەورە خوێندوویەتی (1959)، هەندێ ڕەمەزان هاتووە بۆ شارەزوور و بناری قەرەداغ بۆ مەلایەتی[138]. جگە لە خوێندنی حوجرە، بەکەسێکی خاوەن ئەزموون و قسەخۆش و کۆمەڵایەتی ناوی هەیە، لە ساڵی (1996) لە زەڕایەن کۆچی دوایی کردووە[139].

### مەلا محەمەدی شەل

کوڕی مەلا فەتاحی خەلیفەیە، قۆناغی سەرەتایی فەقێیەتی بڕیووە، سەردەمێکیش لە جێگای مەلا سەعید وتاری هەینی پێشکەش کردووە، ناوبەناویش لەکاتی ڕەمەزان لە گوندەکانی دەوروبەری گڵێجاڵ (مۆرتکە) مەلایەتی کردووە،

---

(138) مەلا عەبدوڵڵا حەمە حەمەوەیس، سەرچاوەی پێشوو ؛ باوا ساڵح ئەحمەد نادر، سەرچاوەی پێشوو؛ عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

(139) عەبدولڕەحمانی فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

سەردەمێکیش کوێخای گلێجاڵ بووە و دەوروبەری ساڵانی شەستەکان کۆچی دواییکردووە[140].

### مەلا مەحمودی غەفور

لەدایکبووی ساڵانی چلە، جگە لە گلێجاڵ، ماوەیەک لە سلێمانی فەقێیەتی کردووە (1957)، زانیاریی حوجرەی لە مەلامەحمودی مەلافەرەج وەرگرتووە[141]، دواتر لە سەعداوا و هەندێ گوندی شارەزوور، لە مانگەکانی ڕەمەزان مەلایەتی کردووە، لە زەڕایەن کۆچی دوایی کردووە (2019)، بەر لە ڕاگواستنی گلێجاڵ کۆتا کوێخای ئاواییەکە بووە [142].

### مەلا عەبدوڵلا یوسف

کوڕی سۆفی یوسفی حەمە چەرمەڵە، لەدایکبووی 1932 یە، قورئان خوێن بوو، لە مەولودەکانیشدا هەمووکات قەسیدەی خوێندووەتەوە، وردە کتێبەکانی حوجرەی خوێندووە، سەردەمێکیش هاتووەتە شارەزوور بۆ مەلایەتی و لە گوندی

---

(140) مەلا عەبدوڵلا حەمە حەمەوەیس، سەرچاوەی پێشوو؛ حاجی محەمەد قادر، سەرچاوەی پێشوو؛ مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو؛ باوا ساڵح ئەحمەد نادر، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز ئەحمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو.

(141) مەلا مەحمود هەندێ زانیاری ڕێزمانی عەرەبی بۆ مەلامەحمودی فەرەج بەخەتی خۆی نووسیوە کە لەبەردەستدان و وێنەیان لە ناوەندی کوردستانی زانکۆی سلێمانی هەیە.

(142) سەرچاوەی پێشوو؛ باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ عەبدولڕەحمانی فەتحوڵلا، سەرچاوەی پێشوو.

سەعداواش مەلایەتی کردووە، لەگلێجاڵ و سەعداوا قورئانی بەکۆمەڵێک فەقێ خەتم کردووە، لەهەڵەبجەی شەهید کۆچی دوایی کردووە (2010) و لەزەڕایەن ئەسپەردە کراوە[143].

**مەلا عەبدوڵلا حەمە حەمەوەیس**

قۆناغی سوختەیی بڕیوە و کتێبە سەرەتاییەکانی شەرعزانی خوێندووە و فەقێی مەلا سەعید بووە، ماوەیەکیش لە هەڵەبجە درێژەی بە خوێندنی حوجرە داوە، دواتر لە دەربەندیخان نیشتەجێ بووە[144].

**مەلا محەمەدی مەلا سەعید**

لەدایکبووی سەرەتاکانی پەنجایە، سەرەتا لە بەردەستی مەلا سەعیدی باوکی لە گلێجاڵ خوێندوویەتی، پاشان لە هەڵەبجە زۆر حوجرە و مزگەوت گەڕاوە، لە ساڵی 1974 لەسەردەستی مەلا ساڵحی گەورەی مۆڵەتی وەرگرتووە[145].

---

(143) مەلا عەبدوڵلا حەمە جەمین، سەرچاوەی پێشوو؛ عەبدولڕەحمان یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(144) مەلا عەبدوڵلا حەمە حەمەوەیس، سەرچاوەی پێشوو.

(145) مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.

**ـ مەلا عەزیز عەلی فەتاح**

کوڕی کوێخا عەلی فەتاحە، لەدایکبوی ساڵانی پەنجایە قورئان و وردە کتێبەکانی شەرعزانی وەک "فتح القریب" و عەوامیلەکانی لە حوجرەی گڵێجاڵ خوێندووە[146].

ـ حاجی محەمەدی کاکە هەسەن، موتەرجیمی مەلا سەعید بووە لە نوێژەکانی جومعە، هەروەها حاجی محەمەد سەعید سەردەمێک بانگبێژ و موتەرجیمی جومعە بووە[147].

ـ زۆر فەقێی تر لە گڵێجاڵ ماوەیەکی زۆر خوێندوویانە، هەشیانە ماوەی کەم جوزئی عەمە و تەبارەک یان تا سورەتەکانی (حم) یان خوێندووە لەوانە: عەزیزی مەحمود، قادری مام سەعید، فەتاح محەمەد عەبدوڵڵا و شێخ حەسەن و عەلی محەمەد سەعید، تەهای مەلا محەمەد و.... هتد[148] .

---

(146) چاوپێکەوتنی مەلا عەزیز عەلی فەتاح، هەڵەبجەی تازە، 27/8/ 2020.

(147) حەمەعەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ باوا ساڵح ئەحمەد نادر، سەرچاوەی پێشوو.

(148) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو ؛ فەتاح محەمەد (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

**فەقێ و مەلا میوانەکانی گلێجاڵ:**

- مەلا عەزیز عەلی میرزا، مەلا مەحمودی لهۆنی، مەلا حەسەن ئەحمەد حمەئەمین، مەلا عەزیزی شاوازی، مەلا تایەری کوێرەکی، مەلا عەبدوڵڵای ڕوانسەری، مەلا عەزیزی چەمە نزار[149].

- مەلا وەلی، دوو مەلا مەجید ناو، کە میرکی بوون و خەڵکی دەوروبەری جوانرۆ بوون لەگەڵ مەلا مەحمودی ئەمین[150].

- شێخ ناسری سۆڵاوە، ماوەیەک لە حوجرەی گلێجاڵ خوێندوویەتی، مەلا حەسەنی عەلی نادری بەلەسۆ، مەلا عومەری حاجی ساڵح و...هتد. [151].

---

(149) مەلا محەمەد مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.

(150) حاجی محەمەد قادر، سەرچاوەی پێشوو

(151) فەتاح محەمەد (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

## ژیانی کۆمەڵایەتی

ڕەوشی کۆمەڵایەتی و بژێوی لە گڵێجاڵ بەدەرنەبووە لە تێکڕای گوند و دێهاتەکانی کوردستان کە مۆرکی خێڵەکی و دابونەریتەکانی و ئابووری گوندنشینی بەسەریدا زاڵ بووە. وەک زۆربەی گوندنشینەکانی تری کوردستان و عێراقی سەردەمی پاشایەتی ژیان لە گڵێجاڵ و لە تێکڕای بناری بەمۆ سەخت بووە، هیچ موچە و خزمەتگوزارییەکی میری لە ناوچەکەدا نەبووە[152]، بەپێی سەرچاوەکان تا کۆتایی چلەکان لە تێکڕای گوندەکانی عێراقدا بەوانەی کوردستانیشەوە 70% هەوڵ و کۆشش بۆ دابینکردنی خۆراک ڕۆیشتووە و 30% ماوەتەوە بۆ شتی ڕواڵەتی و نیشتەجێبوون و جلوبەرگ[153].

لەم بەشەدا ئاماژە بە هەندێک بەهای کۆمەڵایەتیی و شێوازی بژێوی خەڵک کراوە بەر لە گواستنەوە بۆ "گوندە هاوچەرخەکان"، کە پێیان دەوترا ئۆردوگای زۆرەملێ.

**تەبایی و گیانی هاوکاریی**

لە بیرەوەری شایەتحاڵەکانی گڵێجاڵدا حاڵەتەکانی کوشتن و ئاوارەبوون و پەلاماردان لەسەر کێشەی زەوی و زار و سنور و پووش و پاوان نە لەناو ئاواییەکە و نە لەگەڵ

---

(152) تۆمارە فەرمییەکانی ئاماری 1957 و 1962 لە خانەی خزمەتگوزاریدا ئاماژەیان بەمە کردووە.

(153) جعفر خیاط، مصدر سابق، ص42.

گوندکانی دراوسێ پێشینەی نییە[154]، ئەمەش ئاستێکی باش لە تەبایی و ئۆقرەیی کۆمەڵایەتی دەردەخات، لەلایەکی تریشەوە کاری هەرەوەز لە ئاواییەکەدا زۆر باوی هەبووە، چ بۆ ئەو کەسانەی وەرِوێرِکە یان منالّی زۆریان نەبووە، یان بۆ مامۆستای مزگەوتی ئاوایی، یان بەپێی نۆرە هەرەوەز (گەل) یان بۆ یەکتر کردووە لەکاری کێلاّن و دروێنە کە دوو قورسترین و ماوەدرێژترین ئەرکی جوتیار بوون[155].

**گەپ و خۆشی**

هاوکات لەگەلّ پابەندی ئاینی، گیانی گاڵتە و گەپ و کەیف و سەفا بەشێوازی تایبەت لە گڵێجاڵدا هەبووە، بەشێکی بەرچاوی گلێجاڵییەکانیش بەهرەی قسەی نەستەق و گۆرانی وتنیان هەیە و حیکایەتی هەندێکیشیان بلاّوە، "لۆتی"یەکان لە ڕۆژهەلاّتی کوردستانەوە هاتوونەتە ئاواییەکە بۆ ئاهەنگ و بەزم سازکردن و لەگەلّ خۆیاندا مەیمونیان هێناوە، بەرامبەر هەندێک پارە خەلّک تەماشایان کردوون و کاتی خۆشیان لەگەلّدا بەسەر بردوون[156]. هەندێک لە پیاوە ڕیش سپی و دیندارەکانیش کە ئەمەیان پێ حەلاّلّ نەبووە، نارِەزاییان دەربرِیوە، جاریش هەبووە کەسێک لە دەرەوەی

---

(154) عەبدولرەحمان حەمە سالّح؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ئەحمەد کەریم عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو.

(155) شێخ محەمەد عەبدولرِحمان، سەرچاوەی پێشوو.

(156) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ حاجی محەمەد قادر، سەرچاوەی پێشوو.

ئاواییەکە شتێک پارەیان پێداون بۆئەوەی نەیەنە ناوەوە بۆ بەزم سازکردن[157].

**شایی و زەماوەند**

گڵێجاڵ و دەوروبەری بۆ زەماوەند خاوەن کولتوورێکی تایبەت بوون، ئەگەر شاییەک هەبوایە، هەموو گوندەکانی دەوروبەر بانگهێشت کراون، لە سەربانەکاندا بەڕە ڕاخراوە و خەڵک دانیشتوون بۆ تەماشاکردنی و کۆمەڵێک خەڵک کە هەڵپەڕکێیان کردووە[158]، لەم بۆنەیەدا خواردن دروستکراوە، خەڵک دەستە دەستە نانیان خواردووە، چونکە دەفر و قاپ و کەوچک کەم بووە[159]. شاییەکانیش زیاتر لە ڕۆژێکیان پێ ئەچوو، هەڵپەرکێی زۆری تیاکراوە و هیچ کات بەیەک ڕۆژ کۆتایی نەهاتووە[160]. شمشاڵ ژەنیش لە ئاواییەکەدا هەبوون کە شمشاڵیان لێداوە[161].

لە شاییەکاندا گۆرانیی و هەڵپەڕکێ سازکراوە، ئەوانەشی ناوبەناو گۆرانیان چڕیوە چەند کەسێک بوون، لەوانەش: شێخ عەلی شێخ عارف، عەلی حەمەجەمین، مەحمود جەنگە [162]، ماین و ئەسپ لە گۆڕەپانەکانی ناو ئاوایی غار غارێنیان پێ کراوە، قسەیەکیش لەسەر زاری گڵێجاڵییەکان بڵاوە کە لە

---

(157) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

(158) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

(159) عەبدولرەحمان حەمە ساڵح، سەرچاوەی پێشوو.

(160) چاوپێکەوتنی شێخ محەمەد عەبدولڕحمان، گڵێجاڵ، 5/ 7/ 2020.

(161) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(162) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

دوای هەموو هەڵپەرکێ و زەماوەندێک ئاهەنگگێڕان وتویانە "سینەی بێ کینە، محەمەد سەڵاوات"[163]، ئەمەش دوور نییە لەو دینداریيە کۆمەڵایەتییەی بەگشتی لە کوردستاندا هەبووە[164].

لە گلێجاڵ پیاوی کۆمەڵایەتی و قسەخۆش هەبوون، مام حسێن فەتاح بەناوبانگترینی ئەوانەیە کە جگە لەوەی پیاوماقووڵ و خاوەن راوێژ بووە، کۆمەڵێک بەسەرهات و حیکایەت و قسەی خۆشیشی هەیە، کە سنوری ئاوایيەکەی تێپەڕاندووە و لەوبەری سیرواندا بڵاوە[165]، جگەلەوەش فەرەجی عەزیز یەکێکی تر بووە لەوانەی لە ئاوایی وەک قسە خۆش ناوی دێت، هەندێ لە قسە و بەسەرهاتەکانی تا ئێستاش لەسەر زار ماون و هەر لەخزمانی ئەویش حاجی

---

(163) ئەم قسەیە لەسەر زاری کۆچکردوو کافیەی عەبدوڵلای وسەین بڵاوە لەناو گلێجاڵییەکانی نیشتەجێی گوند.

(164) تەنانەت ڕیچ لە گەشتەکەیدا بۆ سلێمانی لە 1820، باس لەوە دەکات لە ١٥ی حوزەیران لە بەر هاتنی مانگی ڕەمەزان بە شەو ئاهەنگێکیان سازکردووە، دوو بلوێرژەنی کورد، بلوێریان لێداوە و باشترین ئاوازیشیان گۆرانییەک بووە بە ناوی "لەیلێ گیان"، گۆرانییەکی تریش بە "ئەز دەناڵم". بڕوانە: کلودیوس جیمس ڕیچ، گەشتی ڕیچ بۆ کوردستان 1820، و. محەمەد حەم باقی، تەورێز، 1992، ل154.

(165) خوێندکارێکی ساڵانی نەوەدی زانکۆ کە ئێستا مامۆستای ئامادەییە؛ ئیبراهیم محەمەد، لە ساڵانی نەوەدەکان کە خوێندکار بووە، بەشی هەرە زۆری ئەو حیکایەتانەی تۆمارکردووە بەسەرپەرشتی د. شوکریە ڕەسوڵ وەک باسی دەرچوون لە بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین بەناونیشانی "حیکایەتەکانی حسێنی فەتاح"، بەڵام بەداخەوە دەستخەت و وێنەی ئەو تۆمارە لەبەردەستدا نەماوە.

عەزیزی مام ئەولا بەهەمانشێوە قسەی خۆشی هەبووە، هەروەها عەلی دێ خۆرشە و فەتاحی مستەفا بەهەمانشێوە ناویان زۆر هەیە بۆ قسە خۆشی و بەسەرهاتی تەنز ئامێز[166].

**پرسە و شیوەن**

کاتێک کەسێک بمردایە لە ئاوایی خەڵک دەستیان لە ئیشوکاری خۆیان هەڵگرتووە بۆ بەشداریی پرسەکە تا کۆتایی دەهات، تەنانەت لە وەرزەکانی دروێنە و جووت کردنیشدا[167]، پرسە گێڕانیش لە گلێجاڵ لە 3_ 7 ڕۆژ بووە، لە مزگەوت دانەدەنیشتن وەک ئەوەی ئێستا باوە، بەڵکو هەر لە ماڵ بووە[168]، خاوەن پرسە و کەسوکارەکەی نانی پرسەکەیان دروست کردووە، ئەوەشی نانی پرسەی نەبووایە و دەستی کورت بووایە، خەڵکی گوندەکە هاوکارییان ئەکرد، هەمیشە مەلا سەعید وتویەتی نانی پرسە حەرامە، ئەمەش کاریگەریی لە لاوازکردنی هەبووە، لە پرسەکانی گلێجاڵیشدا کۆتەڵ گێڕان لە شێوەی قورپێوان نەبووە[169]، بەڵام لە هەندێک پرسەدا جلوبەرگی مردوو یان کوژراوەکەیان داناوە و وەک یادەوەری بەسەریدا گریاون[170]. بۆ مردنی خەڵک لە گوندەکانی دەوروبەر چەند کەسێک بە نوێنەرایەتی ئاوایی

---

(166) فەتاح محەمەد، (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

(167) چاوپێکەوتنی محەمەد قادر یوسف، زەڕایەن، 27/6/ 2020.

(168) حاجی محەمەد قادر، سەرچاوەی پێشوو.

(169) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو ؛ عەبدولڕەحمانی حەمە ساڵح، سەرچاوەی پێشوو.

(170) مریەم فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

ڕۆشتوون بۆ سەرەخۆشی، بەمەش گلەیی لەسەر خەڵکی تری ئاوایی کەوتووە. و مەرج نەبوو تاک تاک بچن بۆ بەشداری و فاتیحا خوێندن[171].

**جەژن**

لە جەژنەکاندا هەموو کەسێک لە ماڵی خۆی سینییەک خواردنی بردووە بۆ مزگەوت و پێکەوە لەوێ نانی جەژنیان خواردووە، پاشان گەردن ئازادیان لەیەکتری کردووە، دوای ئەوەش بڵاوەیان لێکردووە[172] لەوە بەدوا کوڕو کاڵ لەسەر کەوەلەکە کۆبوونەتەوە وهەڵپەڕکێیان کردووە و شادیان دەربڕیوە، مناڵانیش یارییە باوەکانیان کردووە[173] (بڕوانە پاشکۆی ئەم کتێبە بۆ ناوی یارییەکان).

---

(171) عەبدولرەحمان حەمەساڵح؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ئەحمەد کەریم عەبدوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

(172) عەبدولڕەحمان حەمەساڵح، سەرچاوەی پێشوو.

(173) تۆفیق کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

## ژیانی ئابووری و باری بژێوی

بۆ یەکەمجار لە سەرەتای چلەکان (1941ز) جۆرێک لە کۆبوونی خۆراک هاتووەتە گڵێجاڵ، کە زیاتر شەکر و چا بووە، هەندێ خەڵکی ئاوایی گوێنی خواردنەکانیان کردووە بە چۆغە و ڕانک و لەکاتی ڕێکردندا خشەی هاتووە، هەندێکجاریش لە گوێنی قەمسەڵە و پاڵتاو دروستکراوە [174].
بۆ هاڕینی گەنم خەڵک روویان کردووەتە شێخ سێڵەی ئێران، دواتر یەکەم ئاشی گاز هاتوەتە پشتکێوی بەمۆ، لەبەر گرانی نرخەکەشی دەوروبەری هەشت کەس لە گڵێجاڵ و بەلەسۆ بەشدارییان کردووە لە کڕینی، کە بریتی بوون لە: حاجی تۆفیقی مەلا فەتاح، حاجی محەمەد کاکەسەن، محمد عەبدوڵا یوسف، مەلا محەمەد خەلیفە، حاجی ڕەشید، حاجی ئەحمەد، عەبدولقادری عەزەم و کەسێکیتر، ئاشەکە لەبەلەسۆ دانراوە، بەگاز ئیشی کردووە، مزەیان وەرگرتووە لەهەقی هاڕینی گەنم، دوای ئەوان شێخ ساحێبی شێخ نەجمەدین ئاشی گازی هێناوەتە گوندی پشتە[175].
تا کۆتایی پەنجاکان خەڵک بە هەندێک خواردن ئاشنا نەبوون وەک فاسۆلیا[176]، خواردنەکانیش زیاتر دانەوێڵە و ئەو

---

(174) حاجی محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو.
(175) چاوپێکەوتنی ئەحمەد عەلی عەبدوڵڵا، گڵێجاڵ، 2020/8/30.
(176) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو ؛ حاجی محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو؛ چاوپێکەوتنی عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا یوسف، سەرچاوەی پێشوو؛ مەحمود عەلی محەمەد، چاوپێکەوتن، سەرچاوەی پێشوو.

بەرهەمانە بووە کە بەهێزی بازوو پەیداکراون وەک: نیسک، نۆک، قەرەخەرمان، پاقلە، چەڵتووک (ڕێژەی زۆرکەم و دانسقە بووە). سالانەش دووجار گۆشت خوراوە کە پایز و بەهاربوون لەکاتی سەربڕینی بەری نوێی مالات، لەوە بەدواوە گۆشت فرۆشی و قەساب لە ئاواییەکەدا نەبووە[177].
لەبری ئەوەش خواردنی وەک ساوەر، قەلەخەرمان، قەیسی، هەڵوژە، نۆک، نیسک، خورماو ڕۆن، هێلکە و ڕۆن، سیر و ماس، ترشاو باوبوون[178]، برنج و گۆشت لە بۆنەکاندا خوراون و زۆربەی کات بەردەست نەبوون[179]، ئەگەر کەسێک شەکر و چا یان خواردنی چەند ڕۆژێکی هەبوایە دڵخۆش بووە، لەبەرئەوەی زۆربەی لەیەک ئاستدا بوون و ڕکابەریکردن لەسەر شتی ڕواڵەتیی نەبووە، قەناعەت و دڵخۆشی زیاتر بووە[180].
بۆ جلوبەرگ زیاتر کەواو سەڵتە باو بوون[181]، زۆر بەکەمی چۆغە و ڕانک هەبوون " ئەگەر کەسێک چۆغە و ڕانکێکی لەبەر بکردایە ئەیانگووت بڕوانە دەڵێی خەڵکی سلێمانییە"[182]، گرنگ لە جلوبەرگدا جۆری قوماش و

(177) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو ؛ عەزیز مەحمود محەمەد ؛ سەرچاوەی پێشوو، چاوپێکەوتنی خاسێ حەسەن، زەڕایەن، 7/ 6/ 2020.
(178) عەبدولرەحمان حەمە سالح، سەرچاوەی پێشوو.
(179) مەحمود مستەفا، سەرچاوەی پێشوو؛
(180) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو؛ شێخ محەمەد عەبدولڕەحمان، سەرچاوەی پێشوو.
(181) حەمەعەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.
(182) عەزیز مەحمود محەمەد؛ سەرچاوەی پێشوو.

دیزاینەکەی نەبووە، بەڵکو داپۆشینی شوێنی عەیب و پۆشتەکردنەوە بووە[183]، لە دوای پەنجاکان وردە وردە مناڵان ڕانک و کراسیان لەبەر کردووە، پاش چەند ساڵێک لە تەمەن دەبوو جامانەش ببەستنەوە، دواتریش چۆغەو ڕانک لەناو گەنجەکاندا بووە باو[184].

خەڵک ساڵی جارێک یان دووجار شەکر و چایان دەکڕی، تا ساڵانی شەستەکانیش، کیلۆیەک چا بە یەک دینار بووە، بەڵام گیسکێک بە ڕوبعە دینارێک و بزنێکی زۆر باش دوو دینار و مەڕێک ئەوپەڕی سێ دینار بووە[185]. ڕەوشی ژیان لە گلێجاڵ و تێکڕای دەڤەرەکە زیاتر لە کۆتایی پەنجاکان و هاوکات لەگەڵ سەردەمی کۆماریدا هەندێ گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە، لەم سەردەمەدا خەڵکی بۆ کرێکاری ڕۆیشتوون بۆ بەنداوی دەربەندیخان، لەوێ بوونەتە خاوەن داهات و بە سیماکانی شارستانیەتی نوێ ئاشنابوون[186]، جگەلەوەش هەڵەبجە بەردەوام لە پەرەسەندندا بووە، لە سەرەتای شەستەکان و لەگەڵ کردنەوەی ناحیەی سیرواندا ئامار و بەدواداچوون هاتووەتە ناوچەکە، لە ساڵی (1963ز) پرۆژەی ئاوی گەچێن کراوەتە لولە و حەوز و خەڵک لە خواردنەوەی ئاوی گەرم و جۆگا ڕزگاریان بووە،

---

(183) حاجی محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(184) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو

(185) حەمە عەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

(186) حاجی مەحمود عەلی، سەرچاوەی پێشوو ؛ ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

پڕۆژەکەش 500 دیناری ئەوکاتی بۆ تەرخانکراوە، بەلمی بناری چیای خۆشک لە گڵێجاڵ و هێنانی بۆری لە هەڵەبجەوە دروستکراوە، حاجی محەمەدی عەزیز و سەید حەمەعارفی گمەیی بەڵێندەری بوون و تائێستاش ئاسەواری حەوز و پڕۆژەکە لە گەچێن ماوە[187].

بەپێی گێڕانەوەکانیش لە دەمی قات و قڕیدا عەلی فەتاح و ئەمین ئەحمەد لە کۆمپانیای ڕێگاوبان و دارستان دامەزراون، دواتر عەلی فەتاح بووەتە چاوساغ بۆ خەڵکیتری ئاواییەکە ڕوو بکەنە کۆمپانیاکە بۆ ئیشکردن[188].

لە گڵێجاڵدا هیچ دووکانێکی گەورە و بازاڕی نەبووە، جگە لە شەکر و چایی فرۆشتنی ماڵان، هەجێجی یان دێوەرە و کەلایی، هاتوون و خواردن و کاڵایان هێناوە، بە پارە یان بە گۆڕینەوە فرۆشتوویانە، سامانی ئەوکاتەش زەوی و ئاژەڵ بووە، هەندێ کەس لە گڵێجاڵ زیاتریان هەبووە، لەوانە: محەمەدی عەزەم، عەبدوڵڵای مەلایوسف، یوسفی حەمەچەرمەڵ، مام حسێن فەتاح، دێ ئامینی هاوژینی فەتحوڵڵای یوسف، حەمەی مەحمود و محەمەدی کاکەسەن و چەند کەسێکی تری ئاواییەکە[189]، لە ساڵەکانی حەفتاشدا لەکاری کڕین و فرۆشتن هەندێ کەس کەوتوونەتە جموجوڵ و لەوانەش حاجی محەمەد عەزیز لە هەڵەبجە، حاجی محەمەد

---

(187) حاجی مەحمود عەلی، سەرچاوەی پێشوو ؛ باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(188) ئەکرەم عەلی فەتاح، زەڕایەن، 8/25/ 2020.

(189) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

عەلی، باوا ساڵح ئەحمەد، ساڵحی بەیجان، حاجی تۆفیقی مەلا فەتاح و حەمەی دێ ئاڵتوون[190].

**ئامێر و داهێنراوە نوێیەکان**

دەوترێت یەکەم کەس کە ڕادیۆی هێناوەتەوە ئاوایی کوێخا عەلی فەتاح بووە (ڕادیۆی کەروجاش)، خەڵک لێی کۆبوونەتەوە و سەریان سوڕماوە ئەم ئامێرە بێگیانە قسە ئەکات[191]، پیاوێکیش بەناوی حەمەی ئایش خەڵکی فێری چاندنی توتن کردووە، ئەحمەدی بەگزاد یەکەمجار مەکینەی خەیاتی هێناوەتە گوند[192]، هەندێکیتریش دەڵێن حاجی تۆفیقی مەلا فەتاح بووە[193]، مەحمودی دێ مەنیج لە سەربازییەوە سەعاتێکی دەستیی هێناوەتەوە و بووەتە جێگای سەرنجی خەڵک کە میلی کاتژمێرەکەی سوڕاوە[194]. وەهاش باس ئەکرێت ئەوڕەحمانی عەلی محەمەد کە لەدایکبووی (1920ز) بووە یەکەم کەسە بانگ کرابێت بۆ سەربازی کردن لە سەردەمی پاشایەتی و ئەوکاتەی ڕۆشتووە کەس بەتەمای گەڕانەوەی نەبووە[195]. هەندێکی تر باس لەوە دەکەن ئەحمەدی ئەوڕەحمان یەکەم کەسە

---

(190) چاوپێکەوتنی محەمەد ئەمین ئەحمەد، گڵێجاڵ، 8/26/ 2020.

(191) حەمەعەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو ؛ عەزیز مەحمود، سەرچاوەی پێشوو.

(192) حاجی محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(193) ئەحمەد عەلی عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو.

(194) فەتاح محەمەد (زێبا): سەرچاوەی پێشوو.

(195) حاجی محەمەد یوسف: سەرچاوەی پێشوو.

چووبێتە سەربازیی لە کەرکوک و لە پاش گەڕانەوەی باسی شتە نوێیەکانی سەردەمی خۆی کردووە[196]، هەروەها ڕێنمایی خەڵکی کردووە چۆن خۆیان لە هێرشی فڕۆکە بپارێزن[197].

هەتا ڕاگواستنی 1978ز، حەمام و سەرئاو هەروەک تەواوی گوندەکانی تری کوردستان لە گوندەکانی پشتکێوی بەمۆدا نەبوون لەوانەش گلێجاڵ[198]، هەروەها لەبری زۆپا و گەرمکەرەوە کلاوڕۆژنە بەکارهاتووە وەک دوکەڵکێشی ئاگر، تا لە ساڵانی دوایی بەر لە بارکردندا زۆپای دار پەیدا بووە[199]. خانووەکانی جارانیش نیشتمانێک و ژووری وڵاخ و ژووری مەڕ و بزن و ژوورێکی کا بووە، هەندێ جار ماڵەکان بۆ پاراستنی ئاژەڵەکانیان لە ژووری سەرووی خۆیان دایانناون [200].

**کاروانیی بۆ هەڵەبجە و خانەقین**

پشتکێوی بەمۆ، گیرفانێکی جوگرافیی داخراوە، لە هەموو لایەکەوە بە چیا (خۆشک و بەمۆ) و ڕووبار (سیروان) گەمارۆدراوە، بەڵام ئەمە نەبووەتە ڕێگر لە بەردەم خەڵک لە

---

(196) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو ؛ فاتم مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(197) مریەم فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

(198) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

(199) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

(200) فاتم مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

هەردوو شاری خانەقین و هەڵەبجە پێداویستی خۆیان دابین بکەن لە ڕێگای کاروانییەوە، بۆ گەیشتن بە هەڵەبجە دەوروبەری 9 کاتژمێر ڕێگەبڕین و پەڕینەوە لە ڕووبارەکە پێویست بووە، بۆ خانەقین دەوروبەری سێ ڕۆژ و شەو[201].
خەڵکی گڵێجاڵ ئاژەڵ و خەڵووز و مریشک و هێلکە و دار و هێش و گۆچان و کەرەستەی کەپر و خانوویان بردووە بۆ هەڵەبجە و خانەقین و دەربەندیخان، لەوێشەوە زیاتر شەکر و چا و خورما و جلوبەرگ و پێڵاو و کەرەستە پێویستەکانی تری ژیانی ڕۆژانەیان هێناوەتەوە و شەکرەکەش میسری بووە [202]، لە مانگێدا خەڵک توانیویانە دوو کاروانی بکەن بەرەو خانەقین، چونکە هەریەکیان هەفتەیەک یان زیاتری پێ چووە و هەفتەیەکیش خەریکی داربڕین یان خەڵووزکردن بوون بۆ کاروانییەکە[203].
لەوکاتەدا نرخەکان زۆر نزم بوون، بەهۆی دەگمەنی دراوەوە، زیاتر شمەک بەشمەک باو بووە، بۆ نمونە هێش و دەسەک و خەڵووزیان بردووە بۆ خانەقین و هەڵەبجە و دەربەندیخان، بە زۆری لە بەرامبەردا شەکر و چایان هێناوەتەوە[204]. جووتی بزن کە سامانی سەرەکی خەڵک

---

(201) حاجی عەبدولڕەحیم عەزیز، سەرچاوەی پێشوو ؛ حاجی مەحمود عەلی، سەرچاوەی پێشوو ؛ حەمە عەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.
(202) مەلا عەلی قادر کۆکۆیی، سەرچاوەی پێشوو ؛ مەلا حەمە ئەمین سەراوی، سەرچاوەی پێشوو.
(203) شێخ محەمەد عەبدولرەحمان، سەرچاوەی پێشوو.
(204) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو.

بووه بە چوار دینار بووه[205]، مەڕ بە سێ دینار و گیسکێک بە یەک دینار کە بەزۆری بە پێشوەختە (سەلەم) فرۆشراوە[206]. فەردەی خەڵووز لە هەڵەبجە لە نێوان 6 بۆ 8 پەنجایی فرۆشراوە و نرخەکەش چەند فلسێک کرێی خان و حەوانەوەی هاتوەتە سەر[207].

جگە لە هەڵەبجە، کاروانییەکان جاربەجار بەرەو سەرپێڵی زەهاو یان ئەزگڵە و جوانڕۆ ڕۆشتوون، بەڵام لەبەر دووری ئەم جۆرە کاروانیانە کەمتر بوون[208]، ئەم کاروانیانەش هەروا بێ کێشە و گرفت نەبوون و جار هەبووە بەهۆی بەفر و بارانەوە کێشەی تێکەوتووە، یان دووچاری جەردە و ڕێگر هاتوون، لە یەکێک لەو کاروانییانەشدا کۆمەڵێک لە گڵێجاڵییەکان لەگەڵ مام فەتاح عەبدولقادر چوونەتە خانەقین ماوەی 18 ڕۆژ بەهۆی بەفرەوە ڕێگەی گەڕانەوەیان لێ گیراوە[209].

گوندنشینەکانی پشتکێو لە کۆندا زیاتر بۆ بژێوی پشتیان بە ئاژەڵداریی و کشتوکاڵ بەستووە، لە گوندەکانەوە جامباز و قەساب دەهاتن و لە گوند مەڕ و ماڵاتیان دەکڕی، خەڵکی گوندیش دانەوێڵە، پاقلەمەنی، گۆچان، دەستەک و خەڵووزیان بردووە بۆ هەڵەبجە بۆ فرۆشتن، لەوێ شوێنێک هەبوو کە

---

(205) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(206) شێخ محەمەد عەبدولرەحمان، سەرچاوەی پێشوو.

(207) فەتاح محەمەد (زێبا): سەرچاوەی پێشوو.

(208) قادر فەتاح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(209) فەتاح محەمەد (زێبا): سەرچاوەی پێشوو.

وەکو هۆتێلی ئێستا وابووە، پێیان وتووە (خان)، شوێنی ئاژەڵ و حەوانەوەی ڕێبوار و کاروانچی تیابووە بەرامبەر چەند فلسێک [210]. بۆ گەیشتن بە هەڵەبجە پێویست بووە لە ڕووباری سیروان بپەڕنەوە، هیچ پردێکیش نەبووە، لە تەنکترین شوێنەوە پەڕیونەتەوە کە ئاوەکە تاوەکو سەر سینگ هاتووە، فەتحوڵڵای عەبدوڵڵای ئەحمەد، فەردە ئاردی لە هەڵەبجە بە کۆڵ هێناوەتەوە بۆ گڵێجاڵ، لەکاتی پەڕینەوە لە سیروان ناچار بووە فەردە ئاردەکە بە هەردوو دەستی بەرزبکاتەوە بۆئەوەی تەڕ نەبێت[211].

لە ساڵانی شەستەکانیشدا کە دەربەندیخان پەرەی سەندووە و گەشەی کردووە لە پاش کردنەوەی بەنداوەکە، هاتوچۆ و کاروانییەکان زیاتر بەرەو ئەوێ بوون، هەندێ ماڵی گڵێجاڵیش هەر بەرەو ئەم شارە نوێیە بەیەکجاری کۆچیان کردووە وەک حاجی محەمەدی یوسف و حاجی عەلی ئەحمەد [212].

**پیشە و کاری دەست**

شتێکی زانراوە کە بەربەرەکانێی سروشت، پەرچەکردار و وەڵامدانەوە بەدوای خۆیدا دەهێنێت، لەم میانەیەشدا خەڵکی ئاوایی گڵێجاڵ بەهۆی دووریی و دەست ڕانەگەیشتنیان بە کەرەستە و ئامێری پێشکەوتوو، خۆیان بە ئیشی دەستی پێداویستی خۆیان دابینکردووە، جگەلە کۆمەڵێک ئاشی گەنم

(210) عەباس کەریم عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو

(211) هەمان سەرچاوە.

(212) محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو

هاڕین که ناو و شوێنەکانیان له لیستی هاوپێچی ئەم کتێبەدا هەیە، ئەم پیشه و کاره دەستییانه زیاتر بریتی بوون له دارتاشی و ڕستن و چنین، لەم بوارەشدا ئەوانەی ناویان هەیە بریتین له وەستا قادر و نەوەکانی که دەستڕەنگین بوون، مەحمود هەلاج، جل وبەرگ و فەرەنجی پەسەکی چنیوه[213]، فەتحوڵڵای یوسف دەستێکی باڵای هەبووه له دەستڕەنگینی و پیشەوەری[214]، له داری ژاڵه هاری برنج کرەکردنی دروستکردووه، عەرەبانەی له دار دروستکردووه بۆ شمەک گواستنەوە، ئەمه جگه له شەن و سێلک و کەرەستەکانی جوتیاری وەک هێش و دەسته کەوشه و قونگڵه و بێشکەی مناڵ و ....هتد[215]. له دوای ئەویش کوڕەکانی لەوانەش سۆفی یوسف درێژەیان پێداوە، جگه لەوانیش عەلی مامۆ قادر دەستی دارتاشی هەبووه[216]، هەر لەم بوارەشدا مام نوری فەتاح جگه لەسوارچاکی، دەستێکی باڵای له ئیشی دەست و بەهرەمەندیی هەبووه [217]، له سەعداواش سەید عەلی و سەید محەمەد لەکاری دەستی و پیشەوەریدا بەرهەمیان هەبووه[218].

---

(213) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو

(214) مریەم فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو

(215) فەتاح محەمەد (زێبا): سەرچاوەی پێشوو؛ ئەحمەد سۆفی کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

(216) حەمەعەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(217) عەبدولڕەحمان حەمه ساڵح، سەرچاوەی پێشوو.

(218) تۆفیق کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

هەروەها هەندێ لە ژنەکان تەونیان هەڵخستوە بۆ دروستکردنی گڵێم و ڕاخەر و ئەو شتانەی کەرەستەی پێویستن و زیاتریش ئەوانە بریتی بوون لە: ئامینی مەلافەرەج ، کافیە عەبدوڵلا حسەین، ئامینە عەبدوڵلا حسێن ، خاسێ قادر عەزیز ، خاسێ کاکەسەن، فاتمە کریم ساڵح ، ئامینە عەزیز مەلا، ڕەعنا غەفور عەزیز، ئامینە عەزیز ئەحمەد، زێبا عەزیز لەگەڵ ئاڵتونی فەتحوڵلا یوسف، کە زۆر ئیشی دەستییان کردووە وەک قاڵی، گڵێم، خوێیان، بەرماڵ، ڕەشکەی کا، مەشکە، کونە و هیزە، چیخ، حەسیر، تەون، دەواری شەش هەسون و دەواری جافی[219]، لەم دواییانەشدا ژنە گەنجەکان فێری کاری دەسترەنگینی بوون وەک دروستکردنی جۆرەکانی کڵاو و نەخش لێدان و هۆندنەوەی جەمەدانێ و یازمە و لەم بوارەشدا غەریبەی ئەحمەد حەمە شەریف[220].

## ڕەوشی تەندروستی و نەخۆشییەکان

لە سەردەمی پاشایەتی بنکەیەکی تەندروستی لە گوندی پشتەی نزیک لە سنوردا هەبووە، ئەم بنکە لە پاش شۆڕشی 1958ز بە گوژمەی هەزار (1000) دینار نۆژەنکراوەتەوە[221]، بەڵام لە گڵێجاڵ و گوندەکانی تری

(219) عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.
(220) عەبدولڕەحمانی حەمە ساڵح، سەرچاوەی پێشوو.
(221) السلیمانیة، پاشکۆی ڕۆژنامەی "الحوداث" لە ساڵی 1968، ناوەندی کوردستان، زانکۆی سلێمانی

پشتکێوی بەمۆ، هیچ خزمەتگوزارییەکی تەندروستی میری لە ئاواییەکەدا نەبووە، بنکەکەی پشتەش سادە و لاواز بووە، بۆیە خەڵک پشتیان بەداودەرمانی کوردەواریی و شارەزایی خەڵکانی بەتەمەن بەستووە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانیان، بۆ ئەوانەشی شکان و دەرچوونی ئێسک بوایە حەمەئەمین عەزیز جەڕاحێکی بەناوبانگ بووە، عەبدوڵڵای مەلایوسفیش دەستی برینپێچی و جەڕاحی هەبووە، دوای ئەوانیش مام نوری فەتاح جگە لە جەڕاحی کاری دانکێشانی کردووە[222]، زۆربەی ئەو چارەسەرانەشی لە ناوچەکە بەکارهاتوون کلاسیک و میللی بوون وەک سەربڕینی گیسک یان ئاژەڵ بەسەر سنگی نەخۆش بۆ ئەوانەی "هەڵاوردە - یان گرتووە" بۆئەوەی خوێنە گەرمەکەی بەسەر سنگیدا بڕوات[223]، جەوەنەی ئاوی گەرمیان لەسەر داناوە، بۆ برین پڕوز و خوێیان بەکارهێناوە[224]، بۆ تاو لەرز و تاوتێ - یان بڕیوە، بۆ لەدایکبوونی مناڵ چلەوڕیان بڕیوە[225]. ئەگەر ئەمانەش چارەسەریان نەکردایە خەڵک ڕوویان لە گوندی پشتە کردووە بۆ ماڵی شێخ ساحێبی نەقشبەندی کە هەندێ چارەسەری پزیشکی و کوردەواری بەکارهێناوە[226]، ناوبراو لە دوای نیشتەجێبوونی لە پشتە سەلاجەی نەوتی هێناوەتە

---

(222) حەمە عەلی سۆفی محەمەد؛ سەرچاوەی پێشوو ؛ قادر فەتاح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(223) حەمە عەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(224) حاجی محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(225) قادر فەتاح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(226) مریەم فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

ناوچەکە، دەرزی مار و دووپشک و هەندێک چارەسەری تێیدا پاراستووە و خەڵکی ناوچەکە ڕوویان تێکردووە و کەڵکیان لێوەرگرتووە [227]، لە یەکێک لەو جارانەی هاتوچۆکردنی نەخۆشەکانیش بۆ خانەقای گوندی پشتە، عەلی عەبدوڵڵای مەلا یوسف بە نەخۆشی گیانی سپاردووە (1958ز) و هەر لە گۆڕستانی "مچە باشە"ی سنوری نێوان پشتە و گڵێجاڵ ئەسپەردە کراوە.

هەندێکجاریش خەڵک ڕوویان کردووەتە شارەکانی ئێران و کرماشان بۆ چارەسەر، لەوانەش شێخ عەبدوڵڵای سەعداوا کە پاش ئەوەی لە ساڵانی شەستەکان مار گەستوویەتی براوەتە ئێران و لە کرماشان گیانی سپاردووە و هەر لەوێ ئەسپەردە کراوە[228]، جگە لە ئەویش لە ساڵی 1974، حەسەن عەلی ڕەعنا کە بە تەقەمەنی بریندار بووە لە گڵێجاڵ، بە کۆڵ و سواری وڵاغ براوەتە ئاوایی بەڕوێن بۆ تیمار و چارەسەر لەوێشەوە بۆ قەسری شیرین و پاشان نەخۆشخانەی شیرین خورشید لە کرماشان و زیاتر لە پێنج مانگ لەژێر چارەسەردا بووە[229]، هۆکاری ئەمەش دابڕان و دوورە دەستی بووە لە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکانی حکومەتی عێراق و دابڕانی ناوچەکە بووە بەهۆی شۆڕشی ئەیلولەوە.

---

(227) شێخ مەحمود شێخ صاحب، سەرچاوەی پێشوو.

(228) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

(229) چاوپێکەوتنی حەسەن عەلی، گڵێجاڵ، 8/ 7/ 2020.

هەر لەمیانەی چارەسەرە میللیی و تەقلیدییەکانیشدا کە هەندێکیان ڕیشەیەکی ئەفسانەییان هەیە، سۆفی کەریمی عەبدوڵڵای عەزیز لە ئاوایی سەعداوا ڕێگەیەکی تایبەتی هەبووە بۆ چارەسەری تاو و لەرزی منداڵان، ناوبراو مشتێک خوێ و دوو نانی هێناوە لە ئێواران شیعرێکی بە دەنگی بەرز و لە ناوەڕاستی ئاوایی خوێندووەتەوە، کە ئەمەیە: "هەسارەی بەر هەسارە (هەسێرە)، ئاشی ماشی بالار، بیکە بەخاتری ئەو سوارە، بەشەو ئەیگری بەڕۆژ بەریدە، بەڕۆژ ئەیگری بەشەو بەریدە"، پاشان خوێکەی ڕشتووە و نانەکەی بۆ سەگەکان فڕێداوە بەو هیوایەی دەرد و نەخۆشییەکە بڕوات بۆ سەگەکان[230].

(230) تۆفیق کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

## کوشتنی مەلا یوسف و تاڵانکردنی گڵێجاڵ (1946ز)

### شێخ و دەرەبەگ:

سەردەمێک تەملیکی زەوی گوندەکانی پشتکێوی بەمۆ و دەوروبەری هەڵەبجە بووەتە جێگەی مشتومڕ و ململانێی بەگ و هەندێ لە شێخەکان، هەردوولاش هەوڵیانداوە لە گوندی گڵێجاڵ جێگە پێی خۆیان قایم بکەن و زۆرترین ڕووبەری زەوی بکەن بەناوی خۆیانەوە[231]. لە ساڵی (1954 ز) هەریەک لە شێخ عەلائەدینی زیائەدین، ماڵی شێخ عەینەدینی شێخ نەجمەدین، وەسمان بەگی شەرەفبەیانی تانە و سکاڵایان پێشکەش بە دادگا کردووە بۆ تەمەلیککردنی زیاتر لە (1198) دۆنم زەوی گڵێجاڵ (بان مەیدان و دەشت)، سەرەنجامیش داواکاریی هەر سێ لایان ڕەتکراوەتەوە لە بەرژەوەندی وەزارەتی دارایی عێراق کە نوێنەرایەتی خەڵکی ئاوایی کردووە [232]، ئەم ناکۆکییەی شێخانی بیارە، لەگەڵ وەسمان بەگ لەسەر تاپۆکردنی زەوییەکان لە کاتێکدایە ژن و ژنخوازی و پەیوەندی هاوبەش لە نێوان هەردوولایان هەبووە؛ یەکێک لە خێزانەکانی شێخ عوسمانی سیراجەدینی یەکەم، کچی عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانییە، هەروەها کچی

---

(231) عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(232) بڕوانە: الوقائع العراقية، العدد 3564، 14 شباط 1955، ملحق، لواء السليمانية، قضاء حلبجة، ڕقم المقاطعة 46 (كليجان).

شێخ عەلادین، هاوسەری کوڕی وەسمان بەگی شەرەفبەیانی بووە[233].

بەپێی دۆکیۆمێنتە فەرمییەکان، شێخ عەلائەدینی بیارە، لە 19 تشرینی دووەمی (1940ز) لە ڕێگەی حکومەتی بەغدای سەردەمی پاشایەتییەوە، 11 پارچە زەوی گوندی گلێجاڵی لەسەر خۆی تەملیک کردووە (31_ 42 لە کەرتی 46 ی قەزای هەڵەبجە)، بەپێی نەخشەی کادسترۆ و ڕووپێوی کشتوکاڵ، ئەم ڕووبەرە دەکاتە زیاتر لە 281 دۆنم، ناڕەزایی و ناکۆکی لەسەر ئەم تاپۆکردنە، بۆماوەی 19 ساڵ درێژەی کێشاوە و لە 1959 دۆسییەکە گەیشتووەتە دادگای تەمیز[234].

هەرچی دەرەبەگی بناری بەمۆیە، وەسمان بەگی شەرەفبەیانی بووە، ئەویش بەهەمان شێوەی شێخەکان، چاوی لەسەر بەشی زۆری زەوی گڵێجاڵ و دەوروبەری بووە، بۆ ئەم مەبەستەش لە ڕێگەی دادگاوە هەوڵی خۆی داوە[235]، جگەلەوەش خەڵکی گوندەکە دەگێڕنەوە هەندێ جەردە و ڕێگر پشتیوان بە وەسمان بەگ، یان بەناوی

(233) بڕوانە مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، 2/ 31_32، 154، 284، 314، 315.

(234) الوقائع العراقية، 3564، 14/ 2/ 1955؛ بڕیاری تەمیزی 55/ 1285 لە 15/ 4/ 1959.

(235) بڕوانە: الوقائع العراقية، العدد 3564، 14 شباط 1955، ملحق، لواء السليمانية، قضاء حلبجة، رقم المقاطعة 46 (كليجان)؛ بڕیاری دادگای تەمیز، 58/ 1285، لە 15/ 4/ 1959.

ئەوەوە، وەک ئامرازی گوشار ناوبەناو هاتوونەتە سەر ماڵەکانی گڵێجاڵ[236]، بەڵام خەڵکەکە ملیان بۆ ئەم گوشارانە نەداوە و لەگەڵ وەسمان بەگدا (1968 مردووە) کەوتوونەتە ناکۆکیی و ململانێیەکی توندەوە، لەم کێشمەکێشەدا قسەیەکی باوی عەبدوڵڵای ئەحمەد بەناوبانگە بەرامبەر وەسمان بەگ کە گوتویەتی " تا پەتری پۆ - پترس بۆرگ - دێین لەسەرت"[237]، هەروەها ئەوەش زۆر بڵاوە کە هەواڵی مەرگی فەتاح ئەحمەد (پەریزاد) بە مژدانە براوە بۆ وەسمان بەگ بەهۆی پشوو درێژی لە بەربەرەکانێی هەوڵەکانی پەلکێشانی بەرەو گڵێجاڵ[238].

خەڵکی گڵێجاڵ توانیویانە زۆرینەی هەرەزۆری گوندەکەیان لە دەرەبەگ بپارێزن، بەڵام ئەمە بەبێ باجدان و هەروا سانا نەبووە، ئەو ماڵە گڵێجاڵییانەی لە بەلەسۆ بوون بەشێکیان لەژێر گوشاری وەسمان بەگ، ناچار بە کۆچکردن و گەڕانەوە بۆ ناو ئاوایی گڵێجاڵ کراون، لەوانەش: عەبدوڵڵای وسەین، ڕەحیمی وەستا قادر، فەرەجی پیروەیس، خەلیفە ئەحمەد، رەمەزانی محەمەد... هتد[239]، جگەلەوەش سنوری زەوییەکانی ئاواییەکە بچوک کراوەتەوە لە ملە خەرمانانی

---

(236) قادر فەتاح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ حەمە عەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(237) فەتاح محەمەد (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز ئەحمەد عەزیز، سەرچاوەی پێشوو.

(238) عەزیز ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(239) قادر فەتاح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

کانی وەیسکێ ـ وە بۆ سنوری ئێستای گڵێجاڵە بچکۆلە[240] و بەپێی بڕیارەکانی تەسویە لە (1951ز) وەسمان بەگ (526) دۆنم زەوی لە بەلەسۆی تەنیشت گڵێجاڵ لەسەر خۆی تۆمارکردووە[241].

## گواستنەوەی زاهیدی شێخ عەلائەدین بۆ گڵێجاڵ

لە کۆتاییەکانی بەهاری (1946ز)، یەکێک لە کوڕانی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی بەناوی زاهید، کە دایکی باوەجانیی بەری ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، لە هەورامانەوە ماڵی هێناوەتەوە گوندی گڵێجاڵ، ئەم هاتنەی کوڕی شێخی بیارە، شەش ساڵ کەوتووەتە دوای ئەوەی کە شێخ عەلائەدینی باوکی (281) دۆنمی دەشتی گڵێجاڵ لەسەر خۆی تاپۆ کردووە، هەروەها لەکاتێکدا بووە کە شێخ لە هەوڵی تاپۆکردنی زیاتر لە (1198) دۆنمی تردا بووە لە دەشت و شاخی گڵێجاڵ[242]، نزیکەکانی شێخ عەلائەدین باس لەوە دەکەن، شێخ زەوییەکانی گڵێجاڵی لە پای زەوی تری

---

(240) لە کۆیادەوەری گلێجاڵییەکاندا وەها باوە کە سنوری کانی وەیسکێ زەوی و موڵکی خەڵکی گڵێجاڵ بووە، بەڵام لە گوشاری وەسمان بەگ سنورەکەی بچوککراوەتەوە بۆ ئەوەی ئێستا، تەنانەت لە نەخشەی کادسترۆشدا (1954) گڵێجاڵە بچکەلە لەسەر خاکی گڵێجاڵ لابراوە. قادر فەتاح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ فەتاح محەمەد (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

(241) وێنەیەک لە بڕیاری تەسویەی کەرتی 43 بەلەسۆ.

(242) بڕوانە: الوقائع العراقية، العدد 3564، 14 شباط 1955، ملحق، لواء السليمانية، قضاء حلبجة، رقم المقاطعة 46 (كليجان)؛ بڕیاری دادگای تەمیز، 58/ 1285، لە 15/ 4/ 1959.

لەکیسچوو لە گوندی ئەحمەدئاوا وەرگرتووە[243]، بەڵام بۆ هەوڵی تاپۆکردنی (1198) دۆنمەکەی تر هیچ زانیاریی و پاساوێک تا ئێستا لەبەردەستدا نییە.

بەپێی گێڕانەوەکان، زاهیدی شێخ عەلائەدین، دوو پیاوی خزمەتکار (حەمەچەتە و حەمەجوڵە)، هاوژینەکەی و کوڕە مناڵەکەی، لەگەڵ دوو ژنی تری خزمەتکاری ماڵ، لە کۆتایی بەهاری 1946 هاتوون بۆ هاوینە هەواری دەشتی گڵێجاڵ[244]، شێخی میوان سەرەتا لەلایەن کۆمەڵێک لە خەڵکی ئاواییەکە ڕێزی لێ گیراوە، کەپر و ساباتیشی بۆ دروستکراوە[245]، هەندێ گێڕانەوەش هەن باس لەوە دەکەن کۆمەڵێک لە خەڵکی گڵێجاڵ خۆیان داوایانکردووە لە جیاتی تەخمینی ڕاستەوخۆی میری، شێخ عەلائەدین زەوییەکانیان بەکرێ بگرێت و ئەمانیش ساڵانە بە ماڵی شێخ بدەن وەک نێوانگیری جوتیار و حکومەت [246]، بەڵام تا ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیەش بەشی زۆری خەڵکی ئاوایی بێ ئاگان لە مەسەلەی تەملیکی هەندێ پارچە زەوی ئاواییەکە.

---

(243) ڕۆژگاری ژیان، ل228.

(244) مەلا حەمەئەمین سەراوی، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتم مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو؛عەبدولرەحمان فەتحوڵڵا یوسف، سەرچاوەی پێشوو، مەحمود عەلی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(245) محەمەد یوسف، چاوپێکەوتن.. سەرچاوەی پێشوو ؛ مریەم فەتحوڵڵا، چاوپێکەوتن، سەرچاوەی پێشوو؛ مستەفا قادر محمد، سەرچاوەی پێشوو.

(246) محەمەد یوسف، چاوپێکەوتن، سەرچاوەی پێشوو ؛ مریەم فەتحوڵڵا، چاوپێکەوتن، سەرچاوەی پێشوو؛ مستەفا قادر محمد، سەرچاوەی پێشوو.

قسەکەرێک بەناوی ماڵی شێخەوە باسی لەوە کردووە، شێخ عەلائەدین بۆ ڕزگارکردنی ناوچەکە لە چەپۆکی وەسمان بەگی عەبدوڵلا بەگی شەرەفبەیانی، زاهیدی کوڕی خۆی ناردووەتە گلێجاڵ، کە مورید و مەنسوبی خۆی تێدا بووە، بەتایبەت کە وەسمان بەگ سۆفی و موریدانی شێخانی بیارەی لە بناری بەمۆ هەراسانکردووە[247]، بەڵام ئەم بانگەشەیە لەلایەک ناجۆرە لەگەڵ پەیوەندی ژن و ژنخوازیی بنەماڵەی شێخ و وەسمان بەگ، لەلایەکی تر لەگەڵ هەوڵی شێخ عەلائەدین بۆ تاپۆکردنی دەیان دۆنمی تر لە زەوی گلێجاڵ، لە نێوان ساڵانی 1940 _ 1954دا نایەتەوە[248].

مەلا یوسفی گلێجاڵ، کە ناوبەناو سەردانی ئاواییەکەی کردووەتەوە لەگەڵ زاهیدی شێخ عەلائەدین کەوتووەتە کێشەوە، چونکە بەپێی گێڕانەوەکان، شێخی میوان وەک خاوەن زەوی مامەڵەی کردووە (ملاک) و پشکی خۆی لە هەموو بەرهەمەکان وەرگرتووە، ئەویش ئەوەی پێ قبوڵ

---

(247) باوکی وافی، لەجیاتی بنەماڵەی شێخ، (تەمموزی 2008): مێژوو بەئاوەژۆیی نابێتە ئاوێنەی واقیع، گۆڤاری (ستاندەر)، ژمارە(34)، دەزگای ستاندەر، هەولێر ؛ موفتی، موحسین (7 و 14 / 7/ 2009) چەواشەکاری و بێ بنەمایی لەو تۆمەت و بوختانەی بە شێخانی هەورامان کراوە، ڕۆژنامەی ستاندەر، ژمارەکانی: (37)، لا 11 ، (38)، لا 11، بەشی یەکەم و دووەم.

(248) بڕوانە: الوقائع العراقية، العدد 3564، 14 شباط 1955، ملحق، لواء السليمانية، قضاء حلبجة، رقم المقاطعة 46 (كليجان)؛ بڕیاری دادگای تەمیز، 58/ 1285، لە 15/ 4/ 1959.

نەکراوە[249]، جگە لەوەش هاوڕێ و هاوسەردەمەکانی مەلا یوسف دەگێڕنەوە ئەوکاتانەی لە هەڵەبجە و دەوروبەری فەقێ بووە، کێشەی زۆری لەگەڵ شێخانی بیارە هەبووە لەسەر موڵکانە و تاپۆکردن و ڕەخنەی زۆری لە هەنگاوەکانیان هەبووە[250].

پاش ماوەیەک لە هاتنی شێخ بۆ گڵێجاڵ، سێ مەلای ئاواییەکە؛ مەلا مەحمودی فەرەج، مەلا سەعید، مەلا یوسف بۆ گەیاندنی هەندێ گلەیی و گازندە، چوونەتەماڵی زاهید شێخ عەلائەدین، لەوێ لەکاتی گفتوگۆ پەیوەندی مەلا یوسف و زاهیدی شێخ عەلائەدین تێکچووە، دانیشتنەکەش بە گرژیی لە نێوان ئەو دوو کەسەدا کۆتایی هاتووە[251]، بەپێی ئەو گێڕانەوەی هەن، مەلا یوسف ڕەخنەی لە شێخ گرتووە، کە جگە لە زەکات وەرگرتنی خۆی، هیچ بەتەنگ کەموکوڕییەکانی ئاواییەکەوە نییە، ئەویش بە توندی و ڕەقی وەڵامی داوەتەوە و لەوە بەدوا بەتەواوی گرژی کەوتووەتە نێوانیانەوە[252].

ئەوانەشی لە نزیکەوە مەلا یوسفیان ناسیوە دەڵێن بۆچوونی وەهابووە، ئەگەر خەڵک زەکاتی خۆیان لەبەر خوا بدەن،

---

(249) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو؛ فەتاح محەمەد عەبدوڵڵا (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

(250) مەلا حەمە ئەمین سەراوی، سەرچاوەی پێشوو؛ حەمە تۆفیق دەروێش، سەرچاوەی پێشوو

(251) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو.

(252) هەمان سەرچاوە

پێویست ناکات بیدەنە شێخ، چونکە ئەو هیچ خاوەن موڵک و ماف نییە لە زەوییەکان[253]، ئەم قسەیەشی بە ڕاشکاوی بە شێخ و پیاوانی باجگری شێخ وتووە[254]، بە خەڵکیشی ڕاگەیاندووە زەوییەکانتان موڵکی میرییە، هیچ مانای نییە، موڵکانەکەی بدەن بە شێخەکان[255]، بەپێی قسەی حەمەی مەلا کەریم، مەلا یوسف، زەکات دانی بە شێخ بەپێچەوانەی دادگەریی ئیسلام زانیوە[256]. هاوڕێکانیشی دەگێڕنەوە ئەوکاتانەی لە عەبابەیلێ موستەعید بووە "بەرامبەر شێخە ـ موڵکدارەکان ـ هەندێک نەفسی هەبووە"، بەلایەوە قورس بووە خەڵک زەکاتی خۆیان بدەن بە ئەو شێخانەی خۆیان کردبوویە خاوەن زەوی ئاوایی، هەر لەم میانەیەشدا زەکات وەرگرتنی شێخی لە خەڵکی گلێجاڵ زۆر پێ ناخۆش بووە و خەڵکی لە دژ هانداون"[257].

لە دەرەوەی ئەو مشتومڕەی موڵکانە و تاپۆیەش، مەلا مەحمودی گەلاڵەیی بەڕێوەبەری پێشووی کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی باسی لەوە کردووە، مەلا یوسف لە دەمی خۆیدا کاریگەر بووە بە بەرهەمی ڕێبەرە منەوەرە چاکسازیخوازە ئیسلامییەکانی قوتابخانەی میسری (محەمەد

---

(253) محەمەدی مەلا فەرەج، سەرچاوەی پێشوو.

(254) عەبدولڕەحمان فەتحوللا، سەرچاوەی پێشوو.

(255) زینەت ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(256) حمەی مەلا کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

(257) مەلا حەمە ئەمین سەراوی، سەرچاوەی پێشوو ؛ عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

عەبدە و محەمەد ڕەشید ڕەزا و...)[258]، هەروەها مەلاکانی هاوسەردەم و هاوڕێی دەڵێن بوێریی و ئازایەتییەکی تێدا بووە[259] و بڕوای بە توانای خۆشی هەبووە[260]، لەناو خەڵکی گلێجاڵیش چەندین قسەوباس هەن، لەسەر ئەوەی لە پاش وەرگرتنی مۆڵەتی مەلایەتی خەریکبووە لە وەزیفەیەکی میریدا لە هەڵەبجە دەستبەکار ببێت، لەبارەی ئەم پۆستەشی هەندێک دەڵێن دادگا، هەندێکی تر دەڵێن مەعاریف (پەروەردە)، هەندێکی تر دەڵێن کارگێڕیی و ناو قایمقامیەت بووە[261]، ئەم گێڕانەوانەش دوور نین لەو قسەو باسانەی لەبارەی ژیانی مەلا یوسفەوە هەن بەتایبەت کە دەوترێت لەگەڵ شاندێکی شاری هەڵەبجەدا چوونەتە لای "وصي" عێراق عەبدولئیلاهی خاڵی مەلیک فەیسەڵ[262] کە لە نێوان 1939 _ 1953 دەمڕاستی پاشای عێراق بووە.

---

(258) ئاراس محەمەد ساڵح، سەرچاوەی پێشوو.

(259) مەلا جەلالی مەلا ساڵحی گەورە، سەرچاوەی پێشوو.

(260) مەلا حەمە ئەمین سەراوی، سەرچاوەی پێشوو.

(261) فاتمی مەلا فەتاح، چاوپێکەوتن.. سەرچاوەی پێشوو ؛ عەبدولرەحمان فەتحوللا، چاوپێکەوتن.. سەرچاوەی پێشوو ؛ باوا ساڵح، سەرچاوەی پێشوو؛ مەحمود عەلی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(262) موحسین موفتی، چەواشەکاری و بێ بنەمایی.. سەرچاوەی پێشوو، 36، لا 11.

## کێشەی تەملیکی گوندەکان

ناجۆریی مەلا یوسف لەگەڵ ماڵی شێخ عەلائەدین و تەملیکی زەوی گوندەکان کە گلێجاڵیشی گرتووەتەوە، لەوکاتەدا لەناو بەشێک لە مەلا و فەقێکانی هەڵەبجەدا بڵاوبووە، هەندێک لە مەلا دێرینەکانی هەڵەبجە هۆکاری ئەمەیان گێڕاوەتەوە بۆ گۆڕانی تەریقەت لە ڕێنمایی ئاینییەوە بۆ دەرەبەگایەتی و هۆکارێک بۆ دەسکەوت چنینەوە، ئەگەرنا پێشتر پەیوەندیی هەردوولا خۆش بووە[263]، ئەم ناڕەزاییە لە ڕەفتاری هەندێک لە شێخەکان لەناو فەقێکانی مزگەوتی تەکیە کە مەلا یوسف و مەلا مەجیدی دەوڵەتئاوا و کۆمەڵێکی تری لێ بووە زەقتر بووە[264].

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دەگێڕێتەوە کە مەسەلەی ناڕەزایەتی مەلاکان لە تاپۆکردنی زەوی گوندەکان لەلایەن شێخانی هەورامانەوە، لە سەردەمی شێخ محەمەد بەهادینی برای شێخ عومەرەوە (1880 مردووە) دەستیپێکردووە، ئەم تاپۆکردنانە لەناو مەلاکاندا بووەتە جێگەی مشتومڕ و "گەلێکیان پێی ڕازی نەبوون"، هەر لەم میانەیەشدا مەلا عەبدوڵڵای عەبابەیلێ ( 1938 مردووە) کە باوکی مامۆستاکەی مەلا یوسفە (مەلا محەمەد)، ناملکەیەکی لەسەر نادروستی و حەرامیی ئەو تاپۆکردنانەی زەوی گوندەکان

(263) مەلا لەتیفی بامۆکی، ژیاننامە، 12/ 3/ 2008، "دەستخەت"، ئەرشیفی بەرزان ئەحمەد.

(264) حەمەتۆفیق دەروێش ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو.

لەلایەن شێخ و دەرەبەگەکانەوە نووسیوە، مەلا قادری گەورەی بیارەش بۆچوونەکەی پەسەند کردووە و لەسەر نامیلەکەکە نووسیویەتی "ڕاست و موتابیقی شەرعە"، بەڵام هۆشداریی ئەوەشی پێداوە کە  کردنەوەی ئەم باسە لەو ڕۆژەدا خراپەی زیاترە[265].

هەر لەسەر مشتومڕی تاپۆکردنی زەوی و تەسویە، هەندێک لە شێخانی نەقشبەندی هەورامان، بەکردەوە لەگەڵ هەندێک مەلا کەوتوونەتە شەڕ و بەرەنگارییەوە لەوانەش، مستەفا زەڵمی کە خۆی لە 1943 لە بیارە فەقێ بووە[266]، بەم هۆیەشەوە مەلا مستەفا بە گێرەشێوێن و بە شیوعی تۆمەتبارکراوە، ڕووبەڕووی هەڕەشەو لێپێچینەوەش کراوەتەوە، هەروەها هەندێ مەلای دیکە بە مونکیر تۆمەتبار کراون[267].

---

(265) بڕوانە یادی مەردان، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1979، 2/ 85 _ 88 و 2/ 575 _ 576.

(266) موستەفا ئیبراهیم زەڵمی، کاروانی ژیانم، چاپی سێیەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، 2018، لا 444 _ 447.

(267) موستەفا ئیبراهیم زەڵمی، سەرچاوەی پێشوو، لا 444_447.

## کوژرانی مەلا یوسفی گلێجاڵی

دەوروبەری سێ مانگ پاش گواستنەوەی زاهیدی شێخ عەلائەدین بۆ گلێجاڵ و لە هاوینی ساڵی 1946[268]، لەکاتێکدا بە میوانی لە گلێجاڵ بووە[269]، مەلا یوسف کوژراوە[270]، لەبارەی چۆنییەتی کوشتنەکەش سەرجەم گێڕانەوەکان یەک دەگرنەوە لەوەی حەمەچەتەی خزمەتکاری شێخ، لە جێگایەک پێدەوترێت (تەنگەکە) بۆسەی بۆ داناوە و بە چەند فیشەکێکی چەکی برنە و کوشتویەتی[271]، بۆ دڵنیابوونەوەش لە کۆتاییهاتنیشی بە قەڵەمبڕ شا دەماری دەستەکانی بڕیوە[272]، بەدوای ئەم ڕووداوەشدا لەلایەن خزمانی مەلا یوسفەوە، کەپریماڵی زاهیدی شێخ عەلادین سوتێنراوە، ژن و کوڕە

---

(268) مەلا سەعید ساڵی کوژرانی مەلا یوسفی بە 1365 ک/ 1946ز تۆمارکردووە، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بەهەمانشێوە ڕۆژگاری ژیان، ل228 ؛ بەرگی مغني المحتاج، ناوەندی کوردستان.

(269) چاوپێکەوتنی محەمەد سبحان قادر، زەڕایەن، 22/7/ 2008.

(270) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ڕۆژگاری ژیان، ل288 ؛ مەلا سەعیدی گلێجاڵ، پەراوێز لەسەر بەرگی "مغني المحتاج"، ئەرشیفی بنەماڵەیی.

(271) مەلا عەبدوڵڵا حمە، سەرچاوەی پێشوو ؛ فاتم مەلا فەتاح؛ سەرچاوەی پێشوو؛ محەمەد یوسف حمە، سەرچاوەی پێشوو؛ عەبدولرەحمان فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو؛ زینەت ئەحمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(272) محەمەد سبحان قادر، سەرچاوەی پێشوو.

مناڵەکەی شێخ بە پەلە پەل لەلایەن هەندێک لە خەڵکی ئاوایی لە ئاگرەکە ڕزگارکراون[273].

هەندێک دەڵێن لەوکاتەدا زاهیدی شێخ عەلائەدین خۆی لەناو ئاواییدا نەبووە و لە گەشت بووە[274]، بەڵام شایەتحاڵی تر هەن باس لەوە دەکەن بینیویانە[275]، هەرچەند مامەکانی مەلا یوسف لەهەندێ ماڵی دۆستانی پێشتری بەدوایدا گەڕاون نەیاندۆزیوەتەوە[276] خەلیفە ئەحمەد کە باوکی مەلا یوسفە و کوڕەکەی کوژرا بوو، بە سواری وڵاخەکەی خۆی خێزانی زاهیدی شێخ عەلائەدین (زینەت خان) و مناڵەکەی، بردووە بەرەو خانەقای شێخانی بیارە لە گوندی گمە[277]، ئەم گێڕانەوەیە لای نزیکەکانی ماڵی شێخیش هەیە و ستایشی ئەم هەنگاوەی باوکی مەلا یوسفیان کردووە[278]، دایکی مەلا یوسف و خوشکەکانی (وەنەوش محەمەد) لەگەڵ تەرمەکە

---

(273) چاوپێکەوتنی زەریفێ قادر، زەڕایەن، 11/6/ 2020.

(274) موحسین موفتی، چەواشەکاری و بێ بنەمایی لەو تۆمەت و بوختانەی بە شێخانی هەورامان کراوە، ڕۆژنامەی ستاندەر، ژمارە 37، 7 و 14 / 7/ 2009 لا11؛ عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(275) حەمە عەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

(276) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(277) زەریفێ قادر، سەرچاوەی پێشوو؛فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو؛مریەم فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو؛خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛عەزیز مەحمود، سەرچاوەی پێشوو؛مستەفا قادر، سەرچاوەی پێشوو.

(278) موحسین موفتی، چەواشەکاری و بێ بنەمایی، گۆڤاری (ستاندەر)، ژمارە (37)، لا 11.

ڕۆشتوون بۆ بنکەی پۆلیسی پشتە، ماوەیەکی زۆر لەوێ بەدیارییەوە باوەشێنیان کردووە، تا ئەوکاتەی ڕەوانەی هەڵەبجە کراوە بۆ لێکۆڵینەوە و دواتر لەوێ ئەسپەردە کراوە[279]، خەڵکی ئاواییەکەش کەوتوون بەسەر ڕووداوی تاڵانکردن و هێرشی لایەنگران و خەزوورانی شێخدا.

## تاڵانکردنی گلێجاڵ

لە پاش ڕۆژی کوشتنی مەلا یوسف و سووتانی کەپری شێخدا، لەشکرێک لە گوندەکانی ئێرانەوە لەسەر سنوور بۆ پشتیوانی زاهیدی شێخ عەلائەدین و تۆڵەکردنەوەی سووتاندنی کەپرەکەی هاتوونەتە سەر ئاوایی گلێجاڵ، بەو هۆیەشەوە شەڕ و ئاژاوەیەکی گەورە دروست بووە[280]، ئەم لەشکرە بێگانەیە کە موریدان و عەشایەری گوندەکانی سەلاس بوون[281]، ئەرکەکانیان لە نێوان خۆیاندا بەمجۆرە دابەش کردووە، بەشێک زیندەماڵ - یان کۆکردۆتەوە، لە چەشنی مەڕ و بزن و گا و مریشک و قەل و قاز، بەشێکی تری لەشکرەکە، مەردە ماڵی وەک چیخ، دەوار، هیزە ڕۆن،

---

(279) زینەت ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(280) چاوپێکەوتنی مستەفا قادر حمە، 6/5 /2020؛عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو؛ ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو؛ خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ زەریفێ قادر، چاوپێکەوتن، سەرچاوەی پێشوو؛ مستەفا قادر محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ مەحمود عەلی، سەرچاوەی پێشوو.

(281) حەمە عەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

کەل و پەلی ماڵ، بەشەکەی دیکەی بەدوای بنەماڵەی مەلا یوسفدا گەڕاون بۆ گرتن و سزادانیان[282].

بەپێی شایەتەحاڵەکان لەشکری هێرشبەر هیچ مەڕ و بزن و مانگایەکیان نەهێشتووە لە ئاوایی کە دەستیان پێی گەشتبێ[283]، هەندێکی تر دەڵێن ئەو ئاژەڵانەی پیادەبوون دراونەتە بەر، ئەو کەل و پەلانەشی بگوازرێتەوە بردوویانن[284] بەبێ ئەوەی جیاوازی بکەن لە نێوان خاوەنەکانیان[285]، تەنانەت ساوەر و گەنم و برۆێش، کە هۆکاری سەرەتایی ژیانی ئەوکات بوون لە دەست لەشکرەکە قوتار نەبووە و لەگەڵ خۆیان بردوویانە[286]، هەمان شتیش بۆ پەلەوەر و مریشک و جووجەڵەی ماڵان[287]. بەهۆی ئەوەشی تاڵانییەکە لە هاویندا بووە کە وەرزی پاش دروێنە و هەڵگرتنی بەروبووم دەکات، خەڵکی ئاواییەکە مایەپووچ

---

(282) محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو؛خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(283) مەلا عەبدوڵڵا یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(284) محەمەدی مەلا فەرەج؛ سەرچاوەی پێشوو؛مەحمود مستەفا، سەرچاوەی پێشوو.

(285) باوا ساڵح، سەرچاوەی پێشوو؛زەریفێ قادر، سەرچاوەی پێشوو؛مەحمود مستەفا نادر، چاوپێکەوتن.. سەرچاوەی پێشوو، حمەی مەلا فەرەج، سەرچاوەی پێشوو.

(286) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(287) زینەت ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

بوون و ئەو خەڵکەی لە گڵێجاڵدا بوون (400_ 450 کەس[288]) ، هۆکار و پێداویستی ژیانیان لەدەستداوە [289].

ئەرکی لەشکری هێرشبەر تاڵانکردن بووە، پاساو و هاندەریشیان بەبێ دین زانینی خەڵکی ئاواییەکە بووە کە کەپری شێخی تێدا سووتاوە[290]، ئەوەشی لەمپەری بۆ دروستکردوون لە وێرانکردنی گڵێجاڵ بەیەکجاریی، کوژرانی عەلی ناوێک بووە لە هێرشبەران کە ئامۆزای کوێخا مستەفای ڕێکخەری لەشکرەکە بووە، ئەم کەسە پێشتر مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی لەگەڵ عەبدوڵڵای مەلا یوسفی مامی مەلا یوسفدا هەبووە[291]، بەمەبەستی پاراستنی خۆی داوە بەسەریدا بۆ بەرگری لێکردنی، بەوهۆیەوە لەلایەن هاوڕێکانییەوە کوژراوە[292]، باوەڕیش وەهایە ئەگەر ئەم کوشتنە ناوخۆییەی ناو هێرشبەران نەبوایە، ئەوە قەسابخانەیەکی

---

(288) لە ساڵی 1957 دانیشتوانی گڵێجاڵ 405 کەس بووە، ساڵێک بەر لەوەش 74 کەس ئاواییەکی نوێ ـ یان دروست کردووە؛ سەعداوە. بڕوانە: الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية التسجيل الاحوال المدنية العامة مديرية الشعبه الفنية، دليل التعداد العام للسنة 1965، مطبعة شركة دار الجمهورية ـ بغداد، ص89.

(289) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو؛ خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ حاجی مستەفا قادر، سەرچاوەی پێشوو.

(290) ئەحمەد سۆفی کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

(291) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز بەلەسۆیی، سەرچاوەی پێشوو؛ حەمە عەلی سۆفی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(292) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو؛ محەمەدی یوسف، سەرچاوەی پێشوو؛خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

خراپتریان له ئاوایی دروست دەکرد[293] ، کەسە کوژراوەکەش بەر لە گیان دەرچوونی هاواریکردووە "گڵێجاڵی کوڕ کوژراوی تاڵانکراو، ئاگای لە کوشتنی من نییە، من گۆڕی خۆم گواوی ناکەم"[294].

هەر لە دەرەنجامی سووتانی کەپرەکەی شێخ، مامێکی مەلا یوسف، بەناوی قادری مەلا یوسف دەستگیرکراوە، پاشان لە زیندان لە بارودۆخێکی تەمومژو و گوماناویدا گیانی سپاردووە و تەرمەکەی نەگەڕێنراوەتەوە بۆ گڵێجاڵ[295] و لەبری ئەوە مشکی و تەزبیح و بەرماڵێکیان ناردووەتەوە[296]، مامەکەی تری عەبدوڵڵای مەلا یوسف، کە فیشەک بەر ناوشانی کەوتبوو، بەسەختی بریندار بووە، پاش چەندین چارەسەر، تا مردنی هەر ئاسەواری پێکرانی لەسەر ماوە[297]، هەرچی تەرمی مەلا یوسفە، ڕەوانەی هەڵەبجە کراوە و پاش سێ ڕۆژ لە کوژرانی لەلایەن هاوڕێکانییەوە لە

---

(293) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو؛ محەمەدی مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.

(294) محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(295) مەحمود عەلی محەمەد، سەرچاوەی پێشوو. ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

(296) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو.

(297)عەزیز بەلەسۆیی، سەرچاوەی پێشوو؛فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو؛ئەوڕەحمانی فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو؛حاجی مستەفا، سەرچاوەی پێشوو.

گۆڕستانی شێخ ئیسماعیل ئەسپەردە کراوە[298]، کەسوکارەکەشی جگەلە باوکی لە هەڵەبجە زیندانی کراون[299].

لە دەمی هێرشەکەدا دووکەس لە خەڵکی گڵێجاڵ کە محەمەدی رەمەزان و فەرەجی عەزیز بوون، بەڕاکردن چوونەتە سەر قوتی بارام بۆ ئەوەی بەچەک بەرگریی لەئاوایی بکەن، بەڵام دیویانە لەشکری هێرشبەر زۆرە و دەرەقەتیان نایەن، دەستیان نەکردووەتەوە[300]، هەموو ئەم پەرچەکردار و مەرگەساتی ئاوایی گڵێجاڵیش لە تۆڵەی سووتاندنی کەپر و کەلوپەلی ماڵی زاهیدی شێخ عەلائەدین بووە، پاساوی بەرگریکارانی شێخی بیارە، بۆ هێرشەکەش سووتانی قورئانێکە لەناو کەپرەکەی ماڵی زاهید[301] ، بەڵام هەندێ لە خەڵکی گڵێجاڵ باس لەوە دەکەن کەپرەکە لە بنەڕەتدا دارو گەڵا و شمەکەکانی ناویشی هەر هی خەڵکی گوندەکە بووە و بە کەرەستەی ئەوان بنیاتنراوە، ئەگەرنا

(298) حەمەی مەلا کەریم، سەرچاوەی پێشوو؛ مەلا حەمە ئەمین سەراوی، سەرچاوەی پێشوو.

(299) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو

(300) فەتاح محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(301) عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

زاهیدی شێخ و خزمەتکارەکانی بەدەستی بەتاڵ هاتوونەتە ئاواییەکە [302].

## ئاوارەبوونی گڵێجاڵ

لە پاش تاڵانکاریی، ماڵەکانی گڵێجاڵ لەلایەک لە ترسی هێرشی تر و لەلایەکی تر بەهۆی لەدەستدانی خۆراک و بەروبوومەکانیان، ناچاربوون گوندەکە چۆڵ بکەن، بنەماڵەکان هەرکەس بەرەو گوندێک هەڵهاتوون کە خزم و ناسرا و یان دۆستایەتییان هەبووبێت، ئەو گوندانەشی خەڵکی گڵێجاڵ و بنەماڵەکان پەنایان بۆ بردوون بریتی بوون لە: بەلەسۆ[303]، گمە [304]، پشتە [305]، قەڵپ[306]، هۆرێن [307] قەسلان لە شێخان[308] ، بەڵام بنەماڵەی مەلا یوسف، لەژێر پارێزگاریی مەفرەزەیەکی گەڕۆکی پۆلیسدا لە ئاوایی گڵێجاڵ

---

(302) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(303) مەحمود عەلی، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز بەلەسۆیی، سەرچاوەی پێشوو؛ باوا سالح، سەرچاوەی پێشوو.

(304) محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو؛ مەلا عەبدوڵڵا یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(305) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

(306) فەتاح محەمەد (زێبا)، سەرچاوەی پێشوو.

(307) مەحمود مستەفا، سەرچاوەی پێشوو.

(308) عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

هێڵراونەتەوە[309] ، هەندێکیشیان وەک تۆفیقی مەلا فەتاح، لەترسی گرتن، بە هاوکاریی هەندێ خێزانی باوایی لەگەڵ دایکی (حەلیم) هەڵهاتووە بۆ ناو خاڵوانی لە ئەزگڵەی ئێران و پاش 27 ساڵ و 1973 لە ژێر پاسەوانی کۆمەڵێک چەکداری خەڵکی گڵێجاڵدا توانیویەتی بگەرێتەوە بۆ ئاواییەکە، هەندێک لەوانەش بریتی بوون لە: مام حسێنی فەتاح ، حمەی تەلاخان، باوا قادر ئەحمەد، فەتاح محەمەد، مەحمودی کاک هەسەن، محەمەدی کاک هەسەن، ئەمینی سلێمان، مەلا محەمەدی خەلیفە، ئەلی نادر لە بەلەسۆ و...هتد[310].

دوای هێوربوونەوەی گرژییەکانیش هەندێک لە خێزان و بنەماڵەکانی گڵێجاڵ لە خانەقای گمە بە ناسراویی و بە تکا، ئاژەڵی خۆیان یان هەندێ سەریان لێ گێڕاوەتەوە[311]، لەم تەنگانەی گڵێجاڵیشدا ئەفسەرێکی پۆلیس بەناوی شێخ ڕەئوف کە خەڵکی کەرکوک بووە و فەرماندەی مەفرەزە گەڕۆکەکە بووە یارمەتی زۆری خەڵکی ئاوایی داوە[312]، ئەم ئەفسەرە

---

(309) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ زینەت ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو؛ مستەفا قادر یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(310) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(311) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(312) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ زینەت ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو؛مستەفا قادر یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی ئاواییەکەش کردووە (دێ مینای هۆخە)، هەروەها وەک کەسێکی باش و چاکخواز و دەستپاک ناوی هەیە[313]، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا ڕیش سپی و پیاوماقوڵی عەشیرەتی باوا، عەبدوڵڵای وەیسی (چوارداران)، بۆماوەی ساڵێک هەندێک لە ئاژەڵ و مەڕ و ماڵاتی خزمانی مەلا یوسفی پاراستووە و هاوکاری خەڵکی گڵێجاڵی کردووە[314].

دۆخی شڵەژاوی ئاوایی گڵێجاڵ، هەروەها دەورانی ئاوارەیی و دەربەدەری خەڵکی گوندەکە، دەوروبەری ساڵێکی خایاندووە، پاشان وردە وردە ژیان لەناو گوندەکە ئاسایی بووەتەوە[315] ، بەڵام لەوە بەدوا بەرەو هەر لایەک ڕۆشتبن بۆ کاروانی یان سەردان، وەک مونکیر و خراپەکار تۆمەتبارکراون بەتۆمەتی ئەوەی ماڵی شێخیان سووتاندووە، ساڵانێکی زۆریش لەسەر ئەم کەپرە باجیان داوە[316]، یەکێک لەوانەشی هەر بەم هۆیەو لەسەر پشتیوانیکردنی مەلا یوسف، دواتر دووچاری هەراسانکردن بووەتەوە محەمەد

(313) خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو؛ محەمەد یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(314) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ مەحمود مستەفا، سەرچاوەی پێشوو؛ مستەفا قادر یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(315) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ عەزیز بەسەلەسۆیی، سەرچاوەی پێشوو؛ مەحمود عەلی، عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(316) عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو؛ خاسێ حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، فاتمی مەلا فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

ڕەمەزان محەمەد بووە کە خۆی بنەماڵەکەی زۆر پشتیوانییان لە مەلا یوسف کردووە، هەروەها خۆی لەگەڵ مام ئەمینی ئەحمەددا زۆر لە مەلا یوسف نزیک بوون و ئەوکاتانەی بەمیوانی هاتوەتەوە هاوەڵییان کردووە[317].

## لێکەوتەکانی کوشتنی مەلا یوسف

کوشتنی مەلا یوسف و ڕووداوەکانی پاش ئەوە کۆ یادەوەرییەکی مەرگەسات و ناخۆشی لە گوندی گڵێجاڵ دروستکردووە، ڕووداوەکە بووەتە مێژووی دیاریکردنی زۆر ڕووداوی تر، دەنگدانەوە و لێکەوتەکانیشی سنوری پشتکێوی بەمۆی تێپەڕاندووە، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کە ئەوکات مامۆستای حوجرەی بیارە بووە، باس لەوە دەکات بەهۆی کوشتنی مەلا یوسفەوە "فیتنە و ئاشوبێکی نالەبار لەوبەری سیرواندا بەرپا بووە"، ئەمەش یەکێک بووە لە هۆکارەکانی بەجێهێشتنی بیارە لەلایەن کاتب و موعتەمەدی چەندین ساڵەی شێخ عەلائەدین کە سەید مەزهەری کاتبە[318].

لە دەرەوەی خانەقای بیارەش لە ناوەندی ئایینیدا زۆر کەس کوشتنی مەلا یوسفیان پێ ناخۆش بووە[319]، بەڵام نەیانتوانیوە بە ئاشکرا هیچ بڵێن، جگە لە مەلا عەزیزی

(317) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(318) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(319) حەمە تۆفیق دەرویش ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو.

پریس[320]، لەکاتی گواستنەوەی گۆڕی مەلا یوسف لە گۆڕستانی شێخ ئیسماعیلەوە بۆ گوڵانی هەڵەبجە (1982)، بەهۆی بەرکەوتنی جادەوە، زۆرێک لە مەلاکانی هەڵەبجە ئامادەی مەراسیمەکە بوون و ناخۆشییەکە نوێ بووەتەوە[321]، لەسایەی بارودۆخی سەردەمی پاشایەتی ئەوکاتیشەوە، دۆسییەی کوشتنی مەلا یوسف و بەسەرهاتی خزمانی و تاڵان و ئاوارەکردنی گڵێجاڵ، نەگەیشتووە بە هیچ ئەنجامێک و لەپای کوشتنەکە و تاڵانەییەکەش هیچ کەس سزا نەدراوە و سەرباری سکاڵای زۆر دۆسییەکە بەبێ ئەنجام ماوەتەوە [322]، دەگێڕنەوە هەرکاتێک باسی سوڵح و ئاشتەوایی کرابێت لە کێشەکە، خەلیفە ئەحمەدی باوکی مەلا یوسف وتویەتی "بەمۆ و هەورامان لەیەکتریان داوە" مەگەر خوا سوڵحی بکات و یەکلایی بکاتەوە و بەخەڵک ناکرێت[323].

(320) مەلا عومەر عەبدولعەزیز، نامەیەک.. سەرچاوەی پێشوو.

(321) مەلا عومەر عەبدولعەزیز، نامەیەک.. سەرچاوەی پێشوو.

(322) عەزیز بەلەسۆیی، چاوپێکەوتن، سەرچاوەی پێشوو؛ محەمەدی مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو.

(323) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.

## دامەزراندنی ئاوایی سەعداوا

ئەم گوندە بەشێکە لە پەرەسەندنی گڵێجاڵ، لە ساڵی (1956ز)، لەلایەن بەشێک لە ماڵەکانی گڵێجاڵەوە دامەزرێنراوە کە یەک بەرەباب و بنەماڵە نین. جێگای ئەم گوندە دەکەوێتە باکووری گڵێجاڵ، بە ئاراستەی خۆرهەڵاتدا، بە هەوایی و لەسەر نەخشە 1.8 کم دوورە لە گوندی دایکەوە، سنووری زەوییەکانی ئاواییەکە تێکەڵە لەگەڵ زەوییەکانی گڵێجاڵ، ماڵەکانیشی سەرجەمیان هەر گڵێجاڵین لە بنەڕەتدا، گۆڕستانی سەرەکیشیان هەر یەک شتە؛ ئیمام محەمەد.

گێڕانەوەکان لەسەر ئەوەن هۆکاری دامەزراندنی ئەم گوندە دەگەڕێتەوە بۆ گەشەکردنی دانیشتوان و ئەرکەکانی ئاوایی گلێجاڵ لە ساڵانی چل و سەرەتای پەنجاکان، لەکاتێکدا کە هیچ خزمەتگوزارییەکی میری پێ نەگەیشتبوو، ئەمەش بارگرانی بۆ خەڵکەکەی دروستکردووە، سرگەی ئاژەڵی ئاوایی کە پاشەڕۆی ئاژەڵی تێدا فڕێ دەدرا کەڵەکە بووە، لە ترسی لە هێرشی دز و باندی دزیکردن بەتایبەت لەبەری ئێرانەوە خانووەکان زۆر نزیک بوون لە یەکتر [324]، ئەمەش

(324) قادر فەتاح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

وایکردووە شێوازی دروستکردنی خانووەکانی گلێجاڵ "کۆوەبوو - تراکمي" بێت [325].

بۆ دەربازبوون لەم قەرەباڵغییە، مەلا مەحمودی مەلا فەرەج کە ئەوکات مەلا و کەسایەتییەکی پیاو ماقوڵ بووە، پێشنیازی کردووە، ئاواییەکە بڵاوەی لێ بکات و ئەوەندەی دەکرێت چەند لقێکی لێ جیاببێتەوە، بەدوای ئەمەشدا هەندێک ماڵ چوونەتە (سەوەردە) لە دامێنی خۆشک، هەندێک ماڵیش چوونەتە (سەعداوا)ی ئێستا، ماڵەکانی سەوەردە نەیانتوانیوە زۆر بمێننەوە، بەڵام ئەوانەی سەعداوا لە جێگای خۆیان ماونەتەوە و توانیویانە بەردەوامبن[326]، هۆکاری شکستهێنانی هەوارگەی سەوەردەش بارینی بەفری زۆر و تەقینی زەوی ژێر ماڵەکان بووە لەو ساڵەدا، بەتایبەت سروشتی جێگاکە وەهایە کە نزارە و لە دامێنی چیادایە[327]. وەها بڵاوە کە ناونانی گوندە نوێیەکەش (سەعداوا) لەسەر پێشنیازی مەلا ئەوڕەحمانی سان ئەحمەدی شەمێرانی بووە کە ئەوکات بانگخوازی شێخی بیارە بووە. لە فەرهەنگە کوردییەکاندا واتایەکی دیاریکراو نییە بۆ (سەعداوا)[328] بەڵام

---

(325) ئەمەش سیمای زۆرێک لە گوندە شاخاوییەکانن یان ئەوانەی بۆ داکۆکی لەخۆیان وا دەکەن یان لەدەوری سەرچاوەیەکی ئاو کۆدەبنەوە. بڕوانە حەلیل ئیسماعیل و ئەیوب خەلیل، سەرچاوەی پێشوو، 146.

(326) مەلا عەبدوڵڵا حەمە حەمەوەیس؛ سەرچاوەی پێشوو، باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(327) عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

(328) لە هەمبانە بۆرینەی هەژاری موکریانیدا هاتووە سەعداوا: گوندێکی کوردستانە، بەعس وێرانی کرد، بەڵام ڕوون نییە ئاخۆ مەبەستی سەعداوای

خەڵکی ئاواییەکە باس لەوە دەکەن ناوەکە هێمایە بۆ دڵخۆشی و سەعادەت[329]، لەسەر قەڵای گەرمیانیش گوندێک بە هەمان ناوەوە هەیە.

بەهەمان شێوەی گڵێجاڵ بەشی زۆری ئەو هۆکارە هاندەرانەی بۆ کۆبوونەوەی خەڵک و دروستبوونی گوند، لە سەعداواش هەیە لە چەشنی: بەرزونزمی خاک و هەڵکەوتە، سەرچاوەی ئاو [330]، گوندەکە لە دامێنی بەرزیدایە، بەردەمی تاڕادەیەک تەختاییە، سەرچاوەی ئاوی هەبووە، لەوەڕگا و مەرعەی پێویستی لە دەور بووە، لە سەردەمی ئاڵۆزییە سیاسییەکان و کێشەی دەرەبەگیشدا دوور بووە لە کێشە و چاودێری و هەندێ ململانێ کە لە گەورە گوندی گڵێجاڵدا هەبووە[331].

گێڕانەوەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە ماڵی شێخ عارفی شێخ قادر و ئامینی هاوسەری فەتحوڵڵای یوسف و مناڵەکانی (یوسف، عەبدولڕەحمان، ئەحمەد)، لە پێشەنگی ئەو ماڵانە بوون کە چوونەتە گوندە نوێیەکەی سەعداوا[332]، بەدوای ئەوانیشدا کۆمەڵێک ماڵی تری وەک باوا ساڵح ئەحمەد نادر، ئەمین

---

گلێجاڵە، یان سەعداوای گەرمیان کە سەر بە ناحیەی سەرقەڵای قەزای کفرییە. بڕوانە: هەمبانە بۆرینە لە ڤەژین بوکس، https://lex.vejinbooks.com/ck/def/henbaneborine

(329) ئەمنە شێخ عارف، سەرچاوەی پێشوو.

(87) خليل اسماعيل، المصدر السابق، ص 72_ 77.

(331) باوا ساڵح، سەرچاوەی پێشوو.

(332) مریەم فەتحوللا، سەرچاوەی پێشوو.

ئەحمەد، عەلی حەمە حەمەوەیس، سۆفی کەریم، سەید محەمەد سەید عەبدوڵڵا، کوڕەکانی ئەوڕەحمانی براخاس (ئەحمەد، عەزیز، مەحمود)، چوونەتە ئەم گوندە نوێیە، بەهۆی ئەوەشی شوێن و جێگاکەی لەبار و گونجاو بووە، بیرۆکەی دامەزراندنی گوندەکە سەریگرتووە[333]. لە دوای ئەوانیش بنەماڵەی شێخەکان چوونەتە گوندەکە؛ شێخ عەلی، شێخ عەبدوڵڵا، شێخ ساڵح، کەریمی ساڵح، دواتریش وردە وردە بەپێی ساڵەکان ژمارەکە هەڵکشاوە و گەورە ماڵەکان ماڵی تریان لێ جیابووەتەوە[334].

لە سەروبەندی دروستبوونی سەعداوادا، ئاماری گشتی (1957ز) لە عێراقدا کراوە، بەڵام بەهۆی دووبنەیی ماڵەکان و بەهێزیی ڕایەڵەکانی سەعداوا و گڵێجاڵ، هەر وەک یەک گوند ئەژمارکراون و پێکەوە تۆمارکراون، بەپێی ئاماری 20 ساڵ دوای ئەوەش (1977) ژمارەی خێزانەکانی (12)خێزان بوون، کۆی ژمارەی دانیشتوانەکەشی (74)کەس بووە [335].

ماوەیەک لە دوای دروستکردنی ئاوایی، مزگەوت لە سەعداوا کراوەتەوە (1957)[336]. سەرپەرشتیاری دروستکردنی مزگەوتەکەش مەلا ئەوڕەحمان بووە کە ئەوکات وەک بریکاری شێخی بیارە (عەلائەدین و سیراجەدینی دووەم) لەو

---

(333) عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو.

(334) مریەم فەتحولڵا، سەرچاوەی پێشوو.

(335) الجمهورية العراقيه، الحهاز المركزی للاحصاء، نتائج ترقيم المباني وحصر السكان لسنة 1977 لمحافظه السليمانية، تشرين الاول 1977، 409.

(336) باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

ناوچەیە گەڕاوە و کاری کردووە، لە پاش ئەوەی پەیوەندیشی لەگەڵ شێخ عوسمانی شێخ عەلائەدین تێکچووە و لە کچی شێخ عەلائەدین (شیرین خان) جیابووەتەوە، پەیوەندی لەگەڵ سەعداوا و هەندێ خێزانی ئەم گوندەدا هەر نەبچڕاوە و پێگەی خۆی لای ئەوان هەر پاراستووە [337]. سەردەمێک مەلا مەحمودی غەفور مەلایەتی لەم مزگەوتەدا کردووە، سەردەمێکیش مەلا عەبدوڵڵای یوسف[338]، هەرچەندە لە مزگەوتی سەعداوا مەلای جێگیر نەبووە، بەڵام کەریمی ساڵح و شێخ عارف و سۆفی کەریم و سۆفی ئەوڕەحمانی فەتحوڵڵا، ناوبەناو بانگیانداوە و سەروکاریی کاروباری مزگەوتەکەیان کردووە، بۆ نوێژی هەینیش خەڵکی ئاواییەکە ڕوویان کردووەتە مزگەوتی گڵێجاڵ[339]، هەفتانەش مەلا سەعید سەردانی کردوون بۆ ئامۆژگاریکردن و لە ماڵی پوری (دێ ئامینی فەتحوڵڵا) خەڵک لە دەوری کۆبوونەتەوە[340].

ئەگەرچی ئەم گوندە لە تۆمارەکاندا گوندێکی سەربەخۆیە، بەڵام لەگەڵ گلێجاڵدا تەواوکەری یەکترن، سەعداوا جگە لە ئاواییەکە، سنوری زەوییەکانی تێکەڵە لەگەڵ زەوییەکانی گڵێجاڵ و هەندێ لە ماڵەکانی زەوییان لە دەشتی گڵێجاڵدا هەیە، لە دۆکیۆمێنتە فەرمییەکان و لە ئاماری (1977ز) دا

---

(337) عەبدولڕەحمانی فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو

(338) باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(339) عەبدولڕەحمانی فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو

(340) عاصمە مەحمود نادر، سەرچاوەی پێشوو.

هەردووکیشیان هەر کەرتی (46)ی قەزای هەڵەبجەن و سنوورەکەیان جیانەکراوەتەوە، هەروەها هەندێک لە خێزانەکانی گڵێجاڵ بەسەر هەردوو گونددا دابەشبوون، لە شایی و شیوەن و جەژنەکانیشدا هەر پێکەوە بوون، کلتوور و یادەوەری و باپیرانیان تێکەڵ و هاوبەشە[341]، لەم گوندەدا موختار و کوێخای فەرمی نەبوون، بەڵام زیاتر ئەحمەدی ئەورەحمان وەک چاوساغ و دەم سپی ئاواییەکە ڕۆڵی بینیوە[342].

## سەردەمی شۆڕش

لە ئەیلولی (1961ز) شۆڕشی کورد دژی ڕژێمی عێراق بە سەرۆکایەتی عەبدولکەریم قاسم، بەخێرایی سەرجەم ناوچەکانی کوردستانی لە زاخۆوە هەتا خانەقین گرتەوە، بەتایبەت ناوچە سنورییەکان، ئەمە لەکاتێکدا پێشتر هیچ ڕاپەڕینێکی تری کوردی لە 1/ 3 ناوچە کوردییەکان تێپەڕی نەکردبوو [343]، لەم شۆڕشەدا پشتێنە شاخاوییەکان بوونە "ناوچەی ئازادکراو"، لەوانەش بناری بەمۆ و گوندەکانی پشتکێوی بەمۆ و ئاوایی گڵێجاڵ.

---

(341) عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو ؛ باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(342) تۆفیق کەریم، سەرچاوەی پێشوو.

(343) عصمت شریف وانلي، كردستان العراقية، هوية وطنية، دراسة في ثورة 1961، ترجمه سعاد محمد خضر، ژين، السليمانية، 2012، 178.

سەرەتا بنکەکانی شۆڕش لە گوندی شمشێرکوڵ و لە دەربەندی بێلولە دانراون، ناوچەکە بەسەر دوو میحوەردا دابەشبووە، کە یەکێکیان لە سەرتەک و بێلولە بووە، ئەویتری لە دیوی کەرگەمل کە عەلی عەسکەریی تێدا بووە[344]، لە دوایساڵی (1962ز) یش، بەرپرسەکانی شۆڕش خۆیان گەیاندووەتە ئەم ناوچەیە بۆ هاندانی خەڵک لەوچوارچێوەیەشدا چوونەتە ئاوایی گڵێجاڵ، لەوانەش نوسەر و خەباتگێڕ، ئەنوەر مایی و حیملی عەلی شەریف. ئەم سەرکردانە، گوتاری کوردایەتی و دروشمەکانی شۆڕشیان بەناو خەڵکدا بڵاوکردووەتەوە و گفتی دابینکردنی کارەبا و باشترکردنی ڕەوشی ژیانیان بە خەڵک داوە[345].
لە گڵێجاڵ مەلا مەحمودی مەلا فەرەج بووەتە دیارترین کادیر و عەزیزی مەحمود و مەحمود مستەفا نادر بە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی گوندی گڵێجاڵ[346]، دواتر مەلا مەحمود بەرپرسیارێتی ناوچەی پێ سپێردراوە[347]، ئەمەش بۆ ئەوکات پلەیەکی باڵای بەرپرسیارێتی بووە لە ناوچەکە.
ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی گڵێجاڵ چوونەتە ڕیزەکانی شۆڕش چ وەک پێشمەرگە و چ پاڵپشت، ئەمانەش زیاتر جوتیارانی سەربەخۆی نیشتمانپەروەر بوون و دووربوون لە کاریگەریی ئەو ئاغا و سەرۆک هۆزە ناسراوانەی کە

---

(344) چاوپێکەوتنی باوا یاسین فەتاح، گڵێجاڵ، 2/ 7/ 2020.
(345) عەزیز مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو.
(346) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو.
(347) باوا یاسین فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

ئەوکات هەندێکیان بۆ مەرامی تایبەت بەخۆیان و گوندەکانیانەوە تێکەڵ بە شۆڕش بوون[348].

دیارترین پێشمەرگە و بەرپرسەکانی شۆڕش لەوکاتەدا حەمە غەدارە، باوا قادر، حەسەنی حەمەساڵح، حەمەی تەڵاخان و مەحمود رەحیم بوون، ژمارەیەکی تر پێشمەرگەیان لەگەڵ بووە وەک باوا یاسین فەتاح، مام حسێنی فەتاح کە جگە لەچەکی خۆی کۆمەڵێک چەکی بۆ گەنجەکان کڕیوە، جگەلەوانیش نزیکەی 20 لە پێشمەرگە گڵێجاڵییەکان لە ئەشکەوتی سماقە بارەگایان داناوە[349]، لەوانەش: فەتاح محەمەد عەبدوڵڵا، عەبدوڵڵا محەمەد عەبدوڵڵا، سدیق حەکیم، فەتاح رەحیم، فەتاح ئەحمەد عەبدوڵڵا، حەمە سەعیدی لەیلێ، کەریم ئەوڕەحیم، قادر سەعید فەتاح، عەزیز محەمەد ئەحمەد، ئەمین فەتحوڵڵا، حمە ڕەشید.. هتد، چەکەکانی ئەوکاتەش زیاتر تفەنگی ئینگلیزیی و سادە بووە، لە ساڵی (1969ز) بۆ یەکەمجار چەکی پێشمەرگەکان کراونەتە بڕنەو [350].

پێشمەرگەکانی خەڵکی گڵێجاڵ بەشداریی زۆر شەڕی ئەوکاتەیان کردووە؛ زمناکۆ، زۆزک، بانی خۆشک، بەمۆ، چەمچەماڵ و پەروێزخان[351]، لە یەکێک لەو شەڕانەشدا لە نزیک قاشتی (1974) حەمەی تەڵاخان کە وەک سەرپەلێکی ئازا ناوی هەیە، لە شەڕی دەستەویەخەدا گیانی سپاردووە،

(348) عصمت شریف وانلي، سەرچاوەی پێشوو، ل188 _ 192.

(349) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو.

(350) باوا یاسین فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(351) چاوپێکەوتنی سلێمان فەرەج عەزیز، گڵێجاڵ، 19/ 7/ 2020.

پاشان لە مەراسیمێکی گەورەدا تەرمەکەی لە هەڵەبجەوە بە سواری وڵاغ گوازراوەتەوە بۆ گڵێجاڵ و لەوێ ئەسپەردە کراوە[352]، هەندێک لە پێشمەرگەکانی گڵێجاڵیش چوونەتە شاخی کۆڕەک و لەوێ بەشداریی شەڕەکانی شۆڕشیان کردووە وەک باوا یاسینی فەتاح و ئەحمەدی تەڵاخان و باوا یاسین بریندار بووە[353]، هەندێکیتریشان وەک باوا قادر لە پێنجوێن و ناوچە دوورەکانیتر پێشمەرگایەتییان کردووە و لەسنوری پشتکێوی بەمۆ چوونەتە دەرەوە[354].

## ناکۆکییەکانی ناو شۆڕش

لە ململانێی باڵی مەکتەبی سیاسی و باڵی مەلا مستەفاشدا (1964ز) ئەم ناوچەیەش بەر ئەو دابەش بوونە کەوتووە، ئەوەش بڵاوە کە ئەوکاتەی مام جەلال هاتوەتە ناوچەکە، مەلا سەعید و مام حسێن فەتاح چوونەتەلای و داوایان لێکردووە، هەوڵ بدەن ناوچەکە بەدووربێت لەو ململانێ ناوخۆییە[355]، هەر لەو کاتەشدا حەسەن حەمە ساڵح (حەسەن گڵێجاڵی) چەکی داناوە و چووەتە سلێمانی، بەڵام لەوێ لەلایەن باڵی مەکتەبی سیاسی تەکلیفی لێکراوە بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ پێشمەرگایەتی و کاری سیاسی، دواتریش لەگەڵ کۆمەڵێک لە

---

(352) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو؛ محەمەد قادر یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

(353) باوا یاسین فەتاح، سەرچاوەی پێشوو.

(354) باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(355) محەمەد ئەمین ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

گلێجاڵییەکان گەڕاوەتەوە بۆ سنوری پشتکێوی بەمۆ، بەڵام ئەمجارە لەناو باڵی مەلا مستەفا خەباتی دەست پێکردووەتەوە و لە (1966ز) وەک سەرپەل لەگەڵ گلێجاڵییەکانی هاوڕێی دەستبەکاربووە[356]، ناوبراو جگە لەپێشمەرگایەتی وەک کەسێکی بە ئەزموون و چاوکراوەو سەرکردە ناسراوە، لەدوای راپەڕین گەڕاوەتەوە بۆ پێشمەرگایەتی و لە 2012 کۆچی دوایی کردووە.

**شەڕ و ململانێکان لەگەڵ شیوعی:**

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا لە سالانی شەست و حەفتا، حیزبی شیوعی لە گوندەکانی دراوسێی بەلەسۆ و چواردااران و گمە و پشتە، کەوتوونەتە چالاکی و جموجوڵ، بەوهۆیەشەوە، هەندێ گرژی لە ناوچەکە، ڕوویداوە، بەڵام نەگەیشتووەتە ئاستی بەریەککەوتن[357]. لە یەکێک لەو گرژییانەدا کەسێک بەناوی "عەبەی شەریف" کە فەرماندەیەکی شیوعی بووە، لەشکری کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر گلێجاڵ، مام حسێن فەتاح سەرپەرشتی چەکدارانی گلێجاڵی کردووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی، بەڵام گەمارۆدانەکە بە ڕێککەوتن کۆتایی هاتووە بەناوبژیوانی تاوگۆزییەکان[358]، هەر لەو شەڕ و ململانێیانەشدا پێشمەرگەی پارتی لە (1963ز) بە

---

(356) چاوپێکەوتنی محەمەد حمە ساڵح، گلێجاڵ، 10/ 7/ 2020.

(357) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو؛ مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو.

(358) سلێمان فەرەج، سەرچاوەی پێشوو.

سەرکردایەتی عەلی عەسکەری، شەڕێکی گەورەیان لەگەڵ شیوعییەکان کردووە لە کەرگەملی سەرە ڕێگای پشتکێو ــ دەربەندیخان، سەرەنجامیش شیوعییەکان شکاون و تا قەرەداغ پاشەکشەیان کردووە[359].

هەر لەو ساڵانەدا (1963ز) کاتێک کە شیوعییەکان زۆر بەهێزبوون لە ناوچەکە، هەڕەشەیان لە مەلا سەعید کردووە لەبەر چالاکییە ئاینییەکانی، چەند پیاوێکی گلێجاڵیش بۆ پاراستنی گیانی تا دوو مانگ چاودێریی و ئێشکگریی ماڵەکەیان کردووە کە ئەوانەی بیرماون، کەریمی ئەوڕەحیم، حەمەی تەلاخان، ئەوڕەحیمی دێ ئامین، باواقادر و مەحموودی مستەفای نادر و چەند پیاوێکی تر بوون[360]، هەروەها لەم بەربەرەکانێیەدا مام حسێنی فەتاح، پشتیوانی زۆری لە مەلا سەعید کردووە[361].

**تۆپباران و ئاوارەبوون**

بارەگا سەرەکییەکانی شۆڕش لە بێلولە و سەرتەک بوون، بەهۆی ڕق و تورەیی ڕژێمیشەوە لەو ناوچە سنوورییە ئازادکراوانە، بەدرێژایی ساڵانی شەشت تا (1974ز) بەردەوام دووچاری تۆپباران و هێرشی فڕۆکە بووەتەوە و خەڵکەکەی ئاوارەی ئەزگڵە و بانی فەقێ و شێخ صلە سەرسنور بوون[362] ، هەندێک جار بەتەواوەتی ئاواییەکە

(359) سەرچاوەی پێشوو.

(360) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

(361) محەمەد ئەمین ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(362) محەمەد حەمەساڵح، سەرچاوەی پێشوو.

چۆڵکراوە بەتایبەت لە ساڵانی (1963ز) و (1974ز)[363]. لە یەکێک لەو تۆپبارانەشدا، دوو پێشمەرگەی گەرمیانی لەناو گڵێجاڵ گیانیان سپاردووە[364].

لە دوا ساڵەکانی شۆڕشدا تەقەمەنی بەجێماوی فڕۆکەکان لە دەوروبەری ئاوایی گڵێجاڵ، بوونەتە هۆی کوشتنی سێ گەنجی ئاواییەکە کە دووانیان برابوون (جەمال و جەلالی عەبدوڵڵای حەمە شەریف) لەگەڵ کەسێکی تر (نوری مەحمودی دێ ئامک)[365]، جگە لەمەش چەندین جار ناو ئاوایی چۆڵ بووە و ماڵەکان بەر تۆپباران کەوتوون و زیانیان پێگەیشتووە، هەر لە تۆپبارانیشدا محەمەد حەمە ساڵح عەزەم بریندار بووە و لە بارەگای سەرتەکی شۆڕش تیمار کراوە[366].

لە پاش نسکۆی شۆڕش لە ساڵی (1975ز)، ژمارەیەک خێزانی گڵێجاڵ ئاوارەی ئێران و پاشان فەلوجە و پارێزگاکانی باشووری عێراق بوون، ئەم خێزانانە دواتر گەڕێنراونەتەوە بۆ هەڵەبجە و پێیان وتراوە (عائدون)، بەشێک لەوانە پاش دەرچوونیان لە گڵێجاڵ، جارێکی تر نەگەڕاونەتەوە بۆ ئاوایی و پەرتەوازەی شارەکانی تر بوون

---

(363) عەباس عەبدولقادر، سەرچاوەی پێشوو.

(364) سلێمان فەرەج، سەرچاوەی پێشوو.

(365) حەسەن عەلی، سەرچاوەی پێشوو.

(366) چاوپێکەوتنی محەمەد حەمە ساڵح محەمەد، دەربەندیخان، 25/ 8/ 2020.

و دواتر له (1978ز) دا ڕاگواستنی بەسەردا هاتووە[367]. لەو خێزانانەی ئاوارەبوون بۆ باشوری عێراق یان نەفی کراون بۆ ئەوێ: عەلی فەتاح مستەفا، عەزیز عەلی فەتاح، حاجی عەزیز مام ئەمین، شێخ تۆفیق ئەحمەد، نوری شێخ عەبدوڵڵا، عەزیز مام ئەوڵا، مەحمود مستەفا نادر، ئەحمەد عەلی عەبدوڵڵا، محەمەد قادر مەلا یوسف، حاجیساڵح بەیجان، فەتحوڵڵای عەبدوڵڵا، کەریم ساڵح، ئەمین سلێمان، لەیلێ عەبدوڵڵا، ئەمین فەتحوڵڵا، محەمەد ئەوڕەحمان مەحمود، محەمەد عەبدولرەحمان (رەعنا)، عەبدولڕەحمان ئەلی محەمەد، محەمەدی مەنیج، سلێمان فەرەج، قادر سەعید، مەحمود ڕەحیم، فەتاح ڕەحیم، شێخ کەریم، محەمەد ئەحمەد عەزەم، عەلی ئەحمەد عەزەم، محەمەد ئەوڕەحمان مەحمود و حمە ساڵح محەمەد مستەفا......هتد[368].

---

(367) محەمەد قادر یوسف، سەرچاوەی پێشوو؛ مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو.

(368) مەحمود مستەفا نادر، سەرچاوەی پێشوو؛ محەمەد قادر یوسف، سەرچاوەی پێشوو.

# بەشی چوارەم
# گۆڕانکارییە کارگێڕییەکان و ئامارەکانی دانیشتوان

عادل صدیق



ماموستای بەشی مێژووە لە زانکۆی هەڵەبجەی شەهید، پسپۆڕی مێژووی نوێیە (سلێمانی)، پێنج کتێبی چاپکراو و چەند توێژینەوەیەکی لە گۆڤارە زانستییەکان هەیە، بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (خاڵ) و جێگری سکرتێری ڕێکخراوی دۆستانی هەڵەبجەیە.

## له هەڵەبجەوە بۆ دەربەندیخان

له سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا (1869ـ 1918) گوندی گڵێجاڵ و ناوچەکانی دەوروبەری له ڕووی کارگێڕییەوە سەر بە ناوەندی قەزای گوڵعەنبەر(هەڵەبجە) بوون، ئەم حاڵەته بەم شێوەیە هەتا کۆتایی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو بەردەوام بووە[369]، له ساڵی 1960 گڵێجاڵ لەگەڵ دەیان گوندی دیکەدا له سەنتەری قەزاکه دابڕێنراون و خراونەته سەر ناحیەی نوێی سیروان[370]، بەڵام دواتر ڕژێمی بەعس بە مەرسومێکی کۆماری له 1978/1/6 لەگەڵ گوندەکانی تری سنوورەکه له ناوچەکانی شەمێران و تاوگۆزیی و ئیمامی لکاندوونی بە قەزای دەربەندیخانەوە[371]، ئەم گۆڕانکارییه له هەمان ساڵی ڕاگواستنی گوندەکه و پشتکێوی بەمۆدا بووەو بەو جۆره ماوەتەوە تا دوای ڕاپەڕینی (1991) و سەرلەنوێ ئاوەدانبوونەوەی گوندەکه.

---

(369) الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، مجموعة الاحصائية لتسجيل عام 1957، لوائى السليمانية وكركوك، مطبعة العنى ـ بغداد، ص234 ؛ خورشيد باشا: رحلة الحدود بين الدولة العثمانية و ايران، ت.مصطفى زهران، ط1، قاهرة، المركز القومى للترجمة، 2008، ص293.

370 د.عبدالله غفور: التشكيلات الادارية في جنوبي كوردستان(1921–2007)، ط2، اربيل، 2008، ص140، 203.

(371) مەرسومی کۆماریی ژماره (68) له ساڵی 1969 به ئیمزای ئەحمەد حەسەن بەکر.

## ئامارەکانی دانیشتوان و خێزان

بەپێی ئامارەکانی سەردەمی پاشایەتی و کۆماریش گوندی گلێجاڵ گەورەترین گوندی پشتکێو بووە و، هەروەها یەکێک بووە لە گوندە گەورە و گرنگەکانی سەر بە قەزای هەڵەبجە[372]، لە بەناوبانگترین ئاماری عێراقدا (1957) ژمارەی دانیشتوانەکەی زیاتر بووە لە 400 کەس، لەکاتێکدا بۆ ئەو کاتە تێکڕای قەبارەی گوند لە کوردستانی عێراقدا 117 کەس بووە، لە حەفتاکانیشدا دوو هێندەی ئەم تێکڕایە زیاتر دانیشتوانی تێدا بووە [373]، بەڵام لە وێنە گشتییەکەدا چوونیەک و هاوشێوە بووە لە 95% گوندەکانی تری کوردستان، کە سەرجەمیان دانیشتوانیان کەمتر بووە لە 500 کەس[374].

---

(372) بڕوانە: الجمهورية العراقيه، وزارة الداخلية(مديرية الداخلية العامة)، الموسوعة الاحصائية عن التقسيمات الادارية في الجمهورية العراقية، والمشاريع المنجزه خلال ثلاث سنوات في العهد الثورة المباركة، مطبعة الادارة المحلية ـ بغداد، 1962، ص143 ؛ الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية تسجيل الاحوال المدنية العامة ـ ديرية الشعبة الفنية، دليل التعداد العام للسنة 1965، مطبهة شركة دار الجمهورية ـ بغداد، ص84-90 ؛ الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهازی المركزی للاحصاء، هيئة التعداد العام والدراسات السكانية، نتائج ترقيم المبانی والحصر السكان لسنة 1977 لمحافظة السليمانية، ص404-411 ؛ د.عەبدوڵڵا غەفور: گوندەکانی کوردستان ـ گوندەکانی باشووری کوردستان لە سەرژمێری دانیشتوانی عێراقدا(1957)، ب2، چ2، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، 2005، ل145-155.

(373) خەلیل ئیسماعیل و ئەیوب خەلیل، سەرچاوەی پێشوو، 142.

(374) خەلیل ئیسماعیل و ئەیوب خەلیل، سەرچاوەی پێشوو، 142.

## ئاماری 1957

یەکێکە لە ئامارە بنەڕەتییەکانی عێراق، بەپێی ئەم ئامارە، دانیشتوانی گلێجاڵ، 405 کەس بوون کە (214) نێر و (191) مێ بووە [375] ، ئەمەش یەکێک بووە لە هۆکارەکانی گرانی دۆزینەوەی هاوژین بۆ گەنجەکان، ئەم ئامارە کە ڕۆژی 11/ 10/ 1957 لەلایەن فەرمانگەی گشتی ڕەگەزنامەوە جێبەجێکراوە، سەرچاوەی پشت پێ بەستراوی بنەڕەتیی سەرجەم حکومەتەکانی عێراق بووە لەبەرئەوەی دروستترینە بە بەراورد بە ئەوانەی پێش خۆی کە ئامارەکانی ساڵانی 1927 و1934و 1947 بوون، لەم ئامارەشدا (1957)، کۆی دانیشتوانی عێراق 6 ملیۆن و 538 هەزار کەس بووە[376].

---

(375) الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية التسجيل الاحوال المدنية العامة مديرية الشعبه الفنية، دليل التعداد العام للسنة 1965، مطبعة شركة دار الجمهورية ـ بغداد، ص89.

(376) المدى (11/ 10/ 2013): إحصاء 1957، https://almadapaper.net/view.php?cat=93971

### تۆماری 1962؛

هەرپێی تۆمارێکی فەرمی حکومەتی عێراقی کە مێژووەکەی بۆ ساڵی 1962 دەگەڕێتەوە، ژمارەی دانیشتوانی گڵێجاڵ (390) کەس بووە[377]، ئەمەش 15 کەس کەمتر ئەکات بە بەراورد بە  چوار ساڵ پێشتر، هۆکارەکەشی بە پلەی یەکەم بۆ کۆچی بەشێک لەخەڵکی ئاوایی بۆ سەعداوا دەگەڕێتەوە (1956)، ئەمە جگە لە کۆچ لە گوندەکە  بۆ شار و ناوچەکانی: هەڵەبجە، گەرمیان و دەربەندیخان[378]، هەروەک لە تۆمارەکەدا هاتووە کە گوندی ناوبراو (62کم) لە ناوەندی یەکە کارگێڕییەکەوە دوورە و پڕۆژەکانی: ئاو، کارەبا و ئاودێری نییە. ئەوە لەکاتێکدا بەپێی هەمان ئامار گڵێجاڵ لە پاڵ چەند گوندێکی دیکەدا لە گوندە گرنگەکانی سنووری قەزای هەڵەبجەی ئەوکات ئەژمارکراوە[379].

(377) الجمهورية العراقيه، وزارة الداخلية(مديرية الداخلية العامة)، الموسوعة الاحصائية عن التقسيمات الادارية في الجمهورية العراقية، والمشاريع المنجزه خلال ثلاث سنوات في العهد الثورة المباركة، مطبعة الادارة المحلية ـ بغداد، 1962، ص143.

(378)  لە هەڵەبجە و دەربەندیخان و گەرمیانیش ژمارەیەک خێزانی گڵێجاڵی هەبوون و هەتا ئێستاش لەوێ ئەژین.

(379)  الجمهورية العراقيه، وزارة الداخلية(مديرية الداخلية العامة)، الموسوعة الاحصائية عن التقسيمات الادارية في الجمهورية العراقية، والمشاريع المنجزه خلال ثلاث سنوات في العهد الثورة المباركة، مطبعة الادارة المحلية ـ بغداد، 1962، ص143.

## ئاماری 1977

بەپێی ئاماری ئەم ساڵە گڵێجاڵ بە کەرتی ژمارە (16) تۆمارکراوە و ژمارەی خێزانەکانی (102) بووە، کە سەرجەمیان خانووی خۆیان هەبووە، هەروەها کۆی ژمارەی دانیشتوانەکەشی (437) کەس بووە. لێرەشدا دەردەکەوێت زیادبوونی دانیشتوانی گوند خاو بووە، بەجۆرێک لە ماوەی 20 ساڵدا (32) کەس زیادی کردووە، بەهۆی کۆچ و ئاوارەییەوە، سەرباری ئەم هێواشی گەشەکردنەی دانیشتوانی گڵێجاڵ کە هۆکاری جۆراوجۆری هەیە لەوانەش کۆچ بۆ سەعداوا [380]. هێشتا ژمارەکە زۆرە ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە ژمارەی خێزانەکانی ناحیەی سیروان لەو ساڵەدا (4211) بووە، ژمارەی دانیشتوانی سەرجەم ناحیەکەش نزیکەی 19 هەزار و 300 کەس بووە [381].

---

(380) الجمهورية العراقيه، الحهاز المركزى للاحصاء، نتائج ترقيم المباني وحصر السكان لسنة 1977 لمحافظه السليمانية، تشرين الاول 1977، 409.

(381) فەرمانگەی ئاماری هەڵەبجە، خشتەی قەزای هەڵەبجە بۆ ساڵەکانی(1977، 1987، 2000، 2002، 2009، 2010) کە ژمارەی دانیشتوان و ژمارەی خێزان دەردەخات.

## کۆچی گلێجاڵییەکان بۆ دەرەوەی گوندەکەیان:

لەگەڵ ئەوەی گلێجاڵ گەورەترین گوندی پشکێو بووە وەک ژمارەی خێزان و دانیشتوان، بەڵام گەشەکردنی زۆر کەم و لاواز بووە، هۆکارەکانیش زۆرو جۆراوجۆرن لەوانەش: کۆچ لە لادێ، خراپی باری تەندروستی، مردنی مناڵ دەگەڕێتەوە، ئەمە جگەلە ئاوارەبوونی پاش نسکۆی شۆڕشی ئەیلول ساڵی 1975، ڕەنگە پێکهاتە چیاییەکەش ڕۆڵی لەمەدا هەبێت کە هەمیشە ئەو گوندانەی پشتیان بە ئاژەڵداری بەستووە لە ناوچە شاخاوییەکان پەرەسەندن تێیاندا هێواش بووە، بەپێچەوانەی پێ دەشتە کشتوکاڵییەکان[382]، بەڵام وا دەردەکەوێت هۆکاری ئەو سستی گەشەکردنە زیاتر بریتی بێت لە شەپۆلێکی کۆچ لە خێزانەکانی گوند بۆ دەرەوەی گوندەکەی خۆیان، بەشی زۆریان بەرەو شارەکان و هەندێکیشیان بۆ گوندەکانی تر چونکە هیچ جۆرە خزمەتگوزارییەکی میری لە گوندەکە نەبووە، هەروەها خەڵک گەڕاون بەدوای ژیانێکی باشتر و هەوڵی جێهێشتنی ژیانی کشتوکاڵییان داوە بۆ ڕۆیشتن بەرەو ژیانی شارنشینی، بەتایبەت پاش ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و هاتنی سەردەمی کۆماری.

گێڕانەوەکان ئاماژە بەوەدەکەن دەستخستنی کار لە دیارترینی ئەو هۆکارانە بوون کە هانی خەڵکی گوندەکەی داوە پەنا بۆ کۆچکردن ببەن بۆ دەرەوەی گوندەکەی خۆیان. ئەو شەپۆلی کۆچ کردنەش لە سییەکان و چلەکانی سەدەی

---

[382] خەلیل ئیسماعیل و ئەیوب خەلیل، سەرچاوەی پێشوو، ل142.

ڕابردووەوە دەستپێکردووە هەتا ساڵی 1978 کە گڵێجاڵ ڕاگوێزراو بەتەواوی چۆڵکرا بەردەوام بووە.
شەپۆلی کۆچکردنەکەش بۆ دەرەوەی گوند بەم شێوەی لای خوارەوە بووە:

**یەکەم ـ سەعداوا**

یەکێک لەو شوێنانەی کە هەندێک لە خەڵکی گڵێجاڵ بەماڵەوە ڕوویان تێکردووە سەعداوا بووە لەدوای ناوەڕاستی پەنجاکانەوە، ئەم کۆچەش کاریگەریی هەبووە لەسەر کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوانی گڵێجاڵ چونکە لە 1977 ژمارەی ئەم ئاواییە 12 خێزان و 74 کەس بوون و لە گڵێجاڵ دەرچوون [383].

**دووەم ـ هەڵەبجە**

وەک پێشتر باسکرا، گڵێجاڵ لە سەردەمی عوسمانییەوە لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بە قەزای گوڵعەنبەر(هەڵەبجە)ی ئەوکات بووە، هەڵەبجە نزیکترین شاریش بووە لە گڵێجاڵەوە، ڕاستە هەندێک جار گڵێجاڵییەکان بۆ ساغکردنەوەی کاڵاکانیان و کڕینی پێداویستییەکانیان هاتوچۆی ناوچەکانی گەرمیان و خانەقین و هەندێک ناوچەی سنووری ئێرانیان کردووە، بەڵام زۆرترین پەیوەندی و هاتوچۆیان لەگەڵ هەڵەبجەدا بووە، هەربۆیە لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانەوە ژمارەیەکی زۆر لە ماڵ و خێزانی گڵێجاڵ بەهۆکاری جیاواز ڕوو لە هەڵەبجە دەکەن و لەو شارەدا

---

[383] الجمهورية العراقيه، الجهاز المركزی للاحصاء، نتائج ترقيم المباني وحصر السكان لسنة 1977 لمحافظه السليمانية، تشرين الاول 1977، 409.

دەگیرسێنەوە، کۆچەکە هەتا ڕاگواستنی گوندە سنوورییەکانی کوردستان(1978) کە حکومەتی عێراقی ناوی لێنابوو پشتێنەی ئاسایش بەردەوام بووە، ئەمانەی خوارەوە بریتین لەو خێزانانەی کە لەو ماوە مێژووییەدا ڕوویان لە هەڵەبجە کردووە و تیایدا بەیەکجاری نیشتەجێ بوون:

| زنجیرە | ناو | زنجیرە | ناو |
|---|---|---|---|
| 1 | محەمەد عەزیز ئەحمەد | 22 | ئەحمەد تەڵاخان |
| 2 | محەمەد ئەحمەد | 23 | مەحمود تەڵاخان |
| 3 | عەلی ئەحمەد | 24 | محەمەد ئەحمەد |
| 4 | مستەفا وەستا قادر | 25 | ڕەئوف عەلی ئەحمەد |
| 5 | عەزیز عەبدوڵڵا | 26 | قادر فەتاح ئەحمەد |
| 6 | سەید ئەحمەد محمد | 27 | صدیق عەلی ئەحمەد |
| 7 | محەمەد فەتحوڵڵا | 28 | عەلی ئەحمەد عەبدوڵڵا |
| 8 | محەمەد فەتاح | 29 | فەتحوڵڵا عەبدوڵڵا |
| 9 | محەمەد تەڵاخان | 30 | ئەمین فەتحوڵڵا |
| 10 | محەمەد قادر یوسف | 31 | عارف فەتحوڵڵا |
| 11 | قادر سەعید | 32 | محەمەد حەمەساڵح |
| 12 | حسەین عەبدوڵڵا | 33 | حەسەن حەمە ساڵح |
| 13 | محەمەد مستەفا | 34 | عەبدوڵڵا ئەحمەد |
| 14 | مەحمود محەمەد | 35 | کەریم ساڵح |
| 15 | خەلیفە ئەحمەد | 36 | مەحمود مستەفا نادر |
| 16 | حەسەن عەبدولقادر (384) | 37 | نامیق کەریم |

(384) هەموو ئەمانە بەر لە ساڵی 1975 چوونەتە شاری هەڵەبجە و لێی گیرساونەتەوە.

| 17 | عەبدولڕەحان عەزیز | 38 | حەمەڕەشید ئەمین ئەحمەد |
| --- | --- | --- | --- |
| 18 | عەبدولڕەحیم عەزیز | 39 | عەزیز ئەحمەد عەزیز |
| 19 | قادر ئەحمەد عەزیز | 40 | حەمەعەلی محەمەد عەزەم [385] |
| 20 | فەتاح ئەحمەد عەبدوڵلا | 41 | عەلی فەتاح مستەفا |
| 42 | فەرەج فەتاح مستەفا | 43 | مام حسێن فەتاح [386] |

**سێیەم ـ دەربەندیخان**

لە سەرەتای دروستکردنی بەنداوی دەربەندیخانەوە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی گوند و دێهاتەکانی نزیک ناحیەی وارماوا(دەربەندیخان) ڕوویان لەو شارۆچکەیە کرد، شانبەشانی ئەو خەڵکانە بەشیک لە خەڵکی گڵێجاڵیش کۆچیان کرد بۆ ئەم شارۆچکەیە، لە دیارترین ئەو خێزانانەشی کە ڕوویان لەم شارۆچکەیە کردووە بریتی بوون لە:

1 ـ سلێمان ئەحمەد ڕەحیم (لە سەرەتای سییەکاندا چووەتە گوندی کوێرەک، دواتر چووەتە دەربەندیخان)

2 ـ عەلی سلێمان ئەحمەد

3 ـ عەلی ئەحمەد مەحمود (حاجی عەلی گڵێجاڵی)

4 ـ حاجی محەمەدی یوسف

5 ـ ئەحمەد مەحمود شاپەسەند

---

(385) ئەمانە لە نێوان سالآنی 1975–1978 ڕوویان لە هەڵەبجە کردووە و تیایدا نیشتەجێ بوون.

(386) ئەمانە لە نێوان سالآنی 1975–1978 ڕوویان لە هەڵەبجە کردووە و تیایدا نیشتەجێ بوون.

6 ـ عەزیزی مەحمودی دێ شاپەسەند (لە تۆڤگە بووە مناڵەکانیان هاتوونەتەوە دەربەندیخان).

7 ـ محەمەد ئەحمەد دێ شاپەسەند

8 ـ غەفوور عەزیز مەحمود شاپەسەند

9 ـ حسەین عەزیز شاپەسەند

10 ـ حەسەن عەزیز شاپەسەند

11 ـ سەید عەلی سەید محەمەد

12 ـ مەلا عەبدوڵڵا حەمە حەمەوەیس

**چوارەم ـ گەرمیان**

جیا لەوانەی پێشوو بەشێکی دیکە لە خەڵکی گڵێجاڵ ڕوویان لە ناوچەکانی گەرمیان کردووە، ئەوانیش بریتین لە:

1 ـ ئەحمەد عەزیز (براو کوڕەکانی لە سەرەتای چلەکان بردووە)

2 ـ عەبدولڕەحمان عەزیز

3 ـ قادر ئەحمەد عەزیز

4 ـ عەبدوڵڵا ئەحمەد عەزیز

5 ـ عەبدولڕەحیم عەزیز

6 ـ مەحمود ڕەمەزان محەمەد و مناڵەکانی (تۆفیق)

7 ـ ئەحمەد مەحمود ڕەمەزان و مناڵەکانی

8_ عەبدوڵلای حمە شەریف

9_ مەحمود حمە شەریف

**پێنجەم ـ سلێمانی**

ئەوانەی کە کۆچیان کردووە بۆ سلێمانی بریتین لە چەند کەسایەتی و خێزانێکی کەم و ئەمانە خوارەوە ناوەکانیانە:

1_ ئەحمەد محەمەد (ئەحە نازە) دواتر چووەتە بەغداو پاشان بەسرە و نەگەڕاوەتەوە.

1 ـ ئەحمەد قادر محەمەد

2 ـ عەلی قادر محەمەد

3 ـ عەبدولڕەحیم قادر محەمەد

4 ـ مەحمود عەبدوڵڵا مەحمود

5 ـ مستەفا قادر محەمەد

هەندێک لەم خێزانانە دواتر لە سەید سادق نیشتەجێ بوون

**شەشەم ـ شەمێران**

لە کۆتایی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا دوو خێزان لە گڵێجاڵەوە چوونەتە ناوچەی شەمێران بەیەکجاری و ئیتر نەگەڕاونەتەوە ئەوانیش:

1_ عەلی مەحمود ڕەحیم (عەلی سوور)

2_ فەرەجی پیروەیس و مناڵەکانی (حمە سەعید، ساڵح، عەلی، حەمە ئەمین).

**حەوتەم ـ ئێران**

لەپاش نسکۆی 1974 کۆمەڵێک خێزانی گڵێجاڵ چوونەتە ئێران، لەپاش ساڵی 1975 زۆرینەیان گەڕانەونەتەوە و نەفی کراون بۆ باشووری عێراق، هەندێ لەو ماڵانەش هەر لەئێران ماونەتەوە و دواتر لە ساڵانی هەشتا و دوای راپەڕینی 1991 بەشێوەی بچڕ بچڕ گەڕاونەتەوە کە ئەمانە بوون:

1_ مەلا مەحمود مەلا فەرەج

2_ محەمەد ئەحمەد موئمین (حەمە غەدارە)

3_ عەباس عەبدولقادر ئەوڕەحیم

4_ محەمەد حسێن فەتاح
5_ حەسەن ئەحمەد حەمە شەریف (نەگەڕاوەتەوە).
6_ شێخ فەرەج فەتاح مستەفا (ئاوارەی ئێران بووە، پاشان ڕاگوێزراوە بۆ هەولێر و لەوێ ماوەتەوە تا ژیانئاوایی کردووە).

بەسەرنجدانیش لە شەپۆلی کۆچ و ڕەوی خەڵک لەئاوایی گڵێجاڵ کۆچیان کردەوە بۆ دەرەوە یان ئاوارەبوون زیاتر بوون لەو خێزانانەی لە گوندەکە ماونەتەوە، هەر بەم هۆیەشەوە گەشەکردنی گوندەکە بە سستی ماوەتەوە.

## ڕاگواستن بۆ زەڕایەن 1978

لە دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، ڕژێمی بەعس پیلانی نوێی ئەوەبوو سەرلەنوێ نەخشەی سرووشتی کوردستان بەپێی خواست و ویستی خۆی داڕێژێتەوە[387]، توانایەکی زۆری سەربازیی و دارایشی تەرخانکرد بۆ جێبەجێکردنی ئەم پیلانە تا ناوچە سنوورییەکان بە قوڵایی 10_ 20 کم بەناوی پشتێنەی ئاسایشەوە ڕابگوێزێت و دانیشتوانەکەی ڕاپێچی ئۆردووگا زۆرەملێکان بکات، کە بەعس ناوی لێنابوون"گوندی هاوچەرخ"[388]، پاڵنەرەکانی ئەم سیاسەتەش جۆراوجۆر

---

(387) میدڵ ئیست ووچ: جینۆساید لە عێراقدا، پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، و.محەمەد حەمەساڵح، چاپخانەی تیشک، سلێمانی، 2004، ل81.

(388) چیا، ڕاگواستنی ناوچە سنوورییەکانی کوردستان، گ(سەنتەری لێکۆڵنەوەی ستراتیژی)، ژ(20)، ساڵی دووەم، تەمموزی1993، ل5 ؛ مراد

بوون؛ بەنمونە ڕێگرتن لە بەکارهێنانیان لەلایەن پێشمەرگەوە بۆ ڕێکخستن و چالاکی، لەگەڵ گەمارۆدانیان بە سەربازگەی سوپایی[389].

یەکەم هەنگاوی ئەم سیاسەتەش لەوبەری سیرواندا لە گواستنەوەی گوندەکانی پشتکێوی بەمۆ و ناوچەکانی تاوگۆزیی و شەمێرانەوە لە سنوری ناحیەی سیروانی قەزای هەڵەبجەوە بۆ سەر قەزای دەربەندیخان دەستیپێکرد، ئەمەش بەپێی مەرسومێکی کۆماری کە لە ڕۆژی 6 ـ 1 ـ 1978دا دەرچووە[390]. پشتێنە ئەمنییەکەش لە گوندەکانی پشتکێوی بەمۆوە درێژدەبوویەوە هەتا دەگەیشتە ڕووباری خاپوور لە قەزای زاخۆ[391].

لەو شاڵاوەشدا گوندی گڵێجاڵ وەک گوندەکانی تری ناوچەکە بەر شاڵاوی زۆرەملێی ڕاگواستن کەوت، لەکاتی پرۆسەکەدا جگە لە تێکدان و سووتاندنی ماڵ و خانووەکانیان، ناوچەکەشیان وەک تەواوی گوندە ڕاگوێزراوەکان کرا بە ناوچەی قەدەغەکراو و هیچ کەس بۆی نەبوو بگەڕێتەوە بۆی

---

حەکیم محەمەد: ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی ڕاگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، 2004، ل129–130 ؛ میدڵ ئێست وۆچ: س.پ، ل83.

(389) چیا: س.پ، ل11 ؛ برایم جەلال: چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، چاپخانەی ڕوون، 2011، ل154–158.

(390) مرسوم جمهوری(68)، رقم(52)، 1978/1/6.

(391) ئەمین قادر مینە: ئەمنی ستراتیجی بەعس و سێکوچکەی بەعسییان(تەرحیل، تەعریب، تەبعیس)، چ2، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، 1999، ب.ش، ل198.

[392]. گوندەکانی پشتکێو لە ئۆردووگای زۆرەملێی تازە دروستکراوی زەڕایەن کە دەکەوێتە سەر ڕێگای سەرەکی سلێمانی - دەربەندیخان کۆکرانەوە و نیشتەجێکران و بەشی زۆریان ئێستاش هەر لەوێ دەژین"[393].
سەبارەت بەشێوازی ڕاگواستنەکەش، سێ مانگ بەر لەو پرۆسەیە نوێنەرانی گوندەکە بانگ کراون بۆ نزیک دەربەندیخان و پلانەکەیان پێ ڕاگەیەنراوە، ئاگادارکراون دەغڵ و دان کۆ بکەنەوە و خۆیان ئامادە بکەن، دواتر لیژنەیەکی حکومی چوونەتە ناو ئاوایی و ئاماری خەڵکیان کردووە، لە 18ی ئابی (1978ز) باریان کردوون بۆ زەڕایەن، لە جێبەجێکردنی ئەم پرۆسەیەشدا سەرباز چواردەوری ئاواییان گرتووە، هەندێ ماڵی ئاوارەی هۆرێن و ئەو ناوچانەش کە پێشتر ئاوارەی گڵێجاڵ ببوون لەو پرۆسەیەدا جارێکی تر بەر بارکردن کەوتوون[394]، لەگەڵ بارکردنی خەڵک خانووەکانیان ڕووخاندوون و ئاگریان تێپەرداون، بەڵام هەندێک قەرەبوویان بە خەڵک داوە لەگەڵ

---

(392) عومەر هەمزە ساڵح: ڕاگواستن لێکۆڵینەوەیەکی جوگرافی و مێژوویی ڕاگواستنی زۆرە ملێی گوندنشینەکانی کوردستان (پشدەر بە نمونە)، چ1، چاپخانەی خانی (دهۆک)، 2009، ل79 ؛ صلاح سعدالله: المسألة الكردية فی العراق، ط2، دار المتنبی للطباعة والنشرة، 2003، ص113 ؛ شۆڕش حاجی: ئەنفالی کورد و دەوڵەتی عێراق، چ2، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، 2002، ل36.

(393) عەبدولڕەحمان حەمە ساڵح، سەرچاوەی پێشوو.

(394) عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

کەلاوەیەک لە ئۆردووگای زەڕایەن[395]، بڕی قەرەبووەکەش جیاواز بووە، لە (1000 هەتا 5000) هەزاری تێدابووە بەپێی خەملاندنی لیژنەکان[396].

## ئاوەدانکردنەوەی گڵێجاڵ (1991)

لە پاش راپەڕینی جەماوەریی (**1991**)، گلێجاڵ بەخێرایی ژیانی بۆ گەڕاوەتەوە، سەرەتای هاوینی ئەو ساڵە ژمارەیەک لە خێزانەکان کە دەورەبەری 30 ماڵ بوون لە ئۆردووگاکانی ئێران گەڕاونەتەوە و لەناو کەپردا لە دەشتی گڵێجاڵ نیشتەجێ بوون، دواتر لەناو ئاوایی سەرلەنوێ خانوویان دروستکردووەتەوە، لە ساڵی (**1992**) بەهۆی کۆمەکی رێکخراوە مرۆییەکان و هەندێ هاوکاری کشتوکاڵییەوە ماڵەکان جێگیر بوون و ئاوایی سەرلەنوێ گوندەکە دروست بووەتەوە [397].

## کردنەوەی ناحیەی بەمۆ:

پاش نۆ ساڵ لە ئاوەدانکردنەوەی گڵێجاڵ و مانەوەی وەک گەورە گوندی پشتکێوی بەمۆ، لە کۆتاییەکانی (**1999**) لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە (ئیدارەی سلێمانی) کرایە مەڵبەندی ناحیەیەک بەناوی (بەمۆ) لەسەر میلاکی قەزای خانەقین[398]، ئەم قەزایەش مەڵبەندەکەی لە ناحیەی مەیدان

---

(395) باوا ساڵح ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(396) عەزیز محەمەد ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو.

(397) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(398) سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران(ئیدارەی سلێمانی)، بڕیاری ژمارە (280)، 4/ 1999/11.

بوو، مەرجەعی ئەو گوند و ناوچانەی دیالە بوو کە لە دوای (1991ز) ئازادکرابوون و لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمدا بوون، لە (2003) ئیدارەی خانەقین گەڕایەوە بۆ ناو شارە بنەڕەتییەکەی خۆی لە دیالە و لە سنورەکانی نزیک گڵێجاڵ دوور کەوتەوە، ئەمەش سنورەکەی خستە دۆخێکی ئیداری شپرزەوە، کە دواتر بە گەڕانەوە گڵێجاڵ بۆ سەر هەڵەبجە چارەسەر کرا.

دۆسییەو بەدواداچوونەکانیش دەریدەخات ئەم بازدانە گەورەیەش جگە لە زەمینە ڕەخساوەکان و تایبەتمەندییە مرۆیی و جوگرافییەکانی گوندەکە، بیرۆکە و پێشنیاری حاجی مەحمودی تەڵاخان بووە، لەم ئەرک و بەدواداچوونە ئاڵۆز و ماوە درێژەشدا، هەریەک لە حاجی محەمەد مام عەلی، مەحمود مستەفا نادر هاوکار و بەشدار بوون[399]، هەر ئەم سێ کەسەش لە (2002) سەرپەرشتی بەشداریکردنی گڵێجاڵییەکانیان کردووە لە ڤیستیڤاڵی عێلبەگی جاف، بەڵگەو گێڕانەوەکانیش دەریدەخات، لەدەرەوەی ئاواییەکە لالە سەرحەدی خەلیفە یونس پشتیوان و ئاسانکاربووە، لەرێگەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆسرەت رەسوڵ، سەرۆکی حکومەتی هەرێم (ئیدارەی سلێمانی).

---

(399) مەحمود مستەفا، سەرچاوەی پێشوو ؛ بەرایی و ئەرشیفەکانی فرمان و داواکارییەکانی ناحیەی بەمۆ.

## گەڕانەوە بۆسەر هەڵەبجە

لە ساڵی 2014 فەرمانی بە پارێزگابوونی هەڵەبجە دەرچوو[400]، بەدوای ئەوەشدا خواست و داواکارییەکانی خەڵکی گڵێجاڵ و ناحیەی بەمۆ بۆ گەڕانەوە بۆ سەر ئەو پارێزگایە نوێ و مەرجەعە ئیدارییە دێرینە پەرەی سەند و بووە داواکارییەکی جەماوەریی نەک تەنها لە گڵێجاڵ بەڵکە لە گوندەکانی دەوروبەریش، لەبەر ڕۆشنایی ئەم خواستە و پاش بەدواداچوونی زۆری ئەنجومەنی باڵای ناوچەکە و ئەنجومەنی گڵێجاڵ و ئەنجومەنی گوندەکانی دەوروبەر و کەسایەتییەکانی گڵێجاڵ و ناوچەکە فەرمانگە حکومییەکان، لە ئەیلولی (2015) دا جارێکی تر بە فەرمانێکی هەرێمی گڵێجاڵ گەڕێنرایەوە بۆ سەر پارێزگای هەڵەبجە، فەرمانەکەش لەسەر ڕاسپاردەی ئەنجومەنی وەزیرانە و (11 ـ 8 ـ 2015) دا دەرچووە [401]، بەدوای ئەمەشدا بە فەرمانێکی کارگێڕی ئیدارەی گەرمیان (20 ـ 10 ـ 2015) بڕیاری پچڕاندنی ناحیەکە لە ئیدارەی گەرمیان و گواستنەوەی بۆ سەر پارێزگای هەڵەبجە دراوە[402]، بەمەش ناحیەکە بوویە

---

(400) هەرێمی کوردستانی عێراق، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، سکرتاریەتی ئەنجومەن، ژمارە(1694)، 20014/3/13 ؛ کۆماری عێراق، هەرێمی کوردستان (سەرۆک)، فەرمانی هەرێمی، ژمارە(19)، 2014/3/16.

(401) کۆماری عێراق، هەرێمی کوردستان، سەرۆک، فەرمانی هەرێمی ژمارە (825)، 1/ 9/ 2015 .

(402) هەرێمی کوردستانی عێراق، ئەنجومەنی وەزیران، وەزارەتی ناوخۆ، ئیدارەی گەرمیان، فەرمانی کارگێڕی، ژمارە (11/ 1/ 2433)، 20/ 10/ 2015.

چوارەمین ناحیەی سەر پارێزگای هەڵەبجە لە دوای هەریەکە لە ناحیەکانی خورماڵ و سیروان و بیارە، بەڵام ئەم گەڕانەوەیە هەروا سانا و بێ کێشە نییە و دووهۆکار ڕێگرن لەوەی ئامانجی خۆیان بپێکن:

1 ـ ڕووباری سیروان و ناوچەی تاوگۆزی کە لە چەندین گوند پێکدێت و دەکەونە ڕۆژئاوای ناوەندی پاریزگای هەڵەبجەوە لە سنوور و سەنتەری پارێزگاکەی دادەبڕن، ئەم گوندانەش کە پێشتر سەر بە پارێزگای هەڵەبجە بوون، هێشتا هەر لەسەر دەربەندیخان ماونەتەوە، بەم پێیەش ناوبڕی جوگرافی دروست بووە.

2 ـ هیچ ڕێگایەکی ڕاستەوخۆ نییە کە ناحیەکە بە سەنتەری پارێزگاکەوە ببەستێتەوە، بۆیە دانیشتوانی ناوچەکە بە ناچاری ڕێگای ناحیەی مەیدان ـ دەربەندیخان ـ شارەزوور ـ سەیدصادق بەکاردەهێنن بەمەبەستی گەیشتنیان بە سنووری پارێزگای هەڵەبجە و ناوەندی پاریزگاکە، بەوەش دەبێ بڕۆنە سنووری ئیدارەی گەرمیان و پارێزگای سلێمانی ئەنجا دەتوانن بگەنە سنووری پارێزگای هەڵەبجە، ئەمەش بەهۆی نەبوونی پردەوە لەسەر سیروان لەگەڵ ڕێگایەکی وشکانی.

**ناحیەی بەمۆ لە ئامارەکانی (2015ـ 2019)دا:**

لە ئێستادا ناحیەی بەمۆ لە ناوەندی ناحیەکە(گلێجاڵ) و سیانزە گوند پێکدێت، ڕووبەری ناحیەکە (137)کم2 و ژمارەی دانیشتوانیشی لە ساڵی (2015) دا بریتی بووە لە (2100) کەس. بەمۆ دوای هاتنی بۆ سەر ئیدارەی پارێزگای هەڵەبجە چ لە ڕووی ڕووبەروو چ لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە بوو بە بچووکترین ناحیە کە لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە پارێزگاکە بێت.

جیا لەم ئامارانەی پێشوو، ساڵی (2019) ئیدارەی ناحیەکە بە سەرپەرشتی سمکۆ سالار، ئامارێکی دانیشتوانی سنوری ناحیەکەیان کردووە، کە تیایدا بەوردی ژمارەی خێزان و کۆی ژمارەی دانیشتوانەکەی خراوەتە ڕوو، ئامارە نوێیەکە بەڕوونی گۆڕانکارییەکان لە ژمارەی خێزان و دانیشتوانی سنووری ناحیەکە نیشان دەدات کە تێیدا گلێجاڵ 87 خێزانە بەدانیشتوانی 330 کەس، بەدوایدا پشتە: 22 خێزان و 182 کەس، بەڕوێن: 14 خێزان و 83 کەس، گمە: 13 خێزان و 90 کەس، کانی پاشا: 9 خێزان و 61 کەس، قەڵپ: 5 خێزان و 20 کەس، کانی وەیسکێ: 5 خێزان و 24 کەس، تووەشکێ: 3 خێزان و 18 کەس، بەلەسۆ: 3 خێزان و 16 کەس، هەردوو گوندی چواردااران 2 خێزان و 10 کەس [403].

(403) ئەم ئامارە لە ناحیەی بەمۆ وەرگیراوە.

# بەشی پێنجەم
# شوێنەوارەکانی گوندی گلێجاڵ

نەوشیروان عەزیز و عوسمان تۆفیق





**نەوشیروان عەزیز:**
ماستەری هەیە لە شوێنەوارناسی لە سۆربۆنی پاریس، دوو کتێبی بڵاوکراوەی هەیە؛ (شارەزوور) و (باسەڕە)، ئەزموونی (١٠) ساڵ کارکردنی مەیدانی هەیە لەکنەو پشکنینی شوێنەوارەکانی کوردستان و چەند توێژینەوە و بابەتێکی بڵاوکراوەی هەیە.

.....................................

**عوسمان تۆفیق:**
ماستەری هەیە لە شوێنەوار و مۆزەخانە لە لیستەری بەریتانیا، ئەزموونی چەند ساڵێك کاری مەیدانی کنەو پشکنینی هەیە لە شوێنەوارەکانی کوردستان، مامۆستایە لە بەشی شوێنەواری زانکۆی سلێمانی و خوێندکاری دکتۆرایە.

پشتکێوی بەمۆ و لەگەڵیشیدا بنارەکە بە هەردوو دیوودا بەشێکە لەو پێ دەشت و چیایانەی کوردستان کە لانە یەکەمینەکانی ژیانن و پڕن لە بەڵگەی ماددیی و شوێنەواری[404]، سەرباری ئەوەی یەکەم تۆماری ئەم ناوچانە دەگەڕێتەوە بۆ ڕووپێوی شوێنەواری عێراقی کە لە سالآنی 1940 _ 1962 ئەنجامدراوە، بەڵام هیچ لەم شوێنەوارانەی بناری بەمۆ لە تۆمارە شوێنەوارییەکانی عێراقدا ناویان نەهاتووە، تەنها نەخش یان بەردەنیگارینەکەی دەربەند ییبێلولە نەبێت کە لە ساڵی 1970دا لە تۆمارەکانی وەک (المواقع الأثرية) و ئەتڵەسەکان ناوی بە هۆرێن ـ شێخان ناسێنراوە [405].

---

[404] Swain Hedley, *An Introduction to Museum Archaeology*, New York, 2007, Pp. 7-9.

(405) المحتف العراقی. المواقع الاثریه فی العراق، بغدا 1970.



نەخشەی ژ. ١ ناو و شوێنی گوندی گڵێجاڵ لە نەخشەی شوێنەوارەکانی ئەو ناوچانەی سەر بە هەڵەبجە بوون.

لەسەر شاخی بەمۆ و لە نزیک گوندی (کانی ژاڵە) دەفرێکی برۆنزی شێوە جام لەلایەن هاوڵاتییەکی ناوچەکەوە دۆزرایەوە و ئێستا لە مۆزەخانەی سلێمانی پارێزراوە، ئەم دەفرە برۆنزییە بەشێوەیەکی هونەری جوان وێنەی سەربازێکی لەسەر نەخشێنراوە کە قەڵغان و ڕمێکی لە دەستە و مێژووەکەی بۆ هەزارەی یەکەمی پێش زایین

دەگەڕێتەوە، ئەمەش هەبوونی ژیان لەوکاتەدا دەردەخات لە ناوچەکەدا.

بە گەڕانەوە بۆ گوندی گڵێجاڵ، لە کتێبی (اطلس المواقع الاثرية في العراق)دا ناوی ئەم گوندە لەگەڵ شوێنەوارەکانی تری سەنتەری هەڵەبجەدا هاتووە (ل77)، ئەمەش ڕەنگە یەکەم ئاماژە و یەکەم تۆماری شوێنەوارەکانی گڵێجاڵ بێت، بەبێ ئەوەی سنوری ئێستای ناحیەی بەمۆ ڕووپێوی شوێنەواریی بۆ کرابێت. لەم ساڵانەی دواییشدا بەرلەوەی گڵێجاڵ بگەڕێتەوە سەر ئیدارەی هەڵەبجە، هەندێ ناوچەی شوێنەواری دیکەی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیانەوە خراوەتە ناو تۆمارەکان [406]، هەر لەم چوارچێوەیەشدا نەخشەی تایبەتی ناوچە شوێنەوارییەکانی بۆ کراوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە 2)

نەخشەی ژ.2، دابەشبوونی بەشێک لە ناوچە شوێنەوارەکانی گوندەکە

---

[406] چاوپێکەوتن لەگەڵ شوێنەوارناس نەوزاد لەتیف، بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان، شوێنی چاوپێکەوتن، 2020/8/7.

بەپێی ئەو ڕووپێوەی توێژەرانی ئەم بەشە لە گڵێجاڵ بە پشتبەستن بە زانیاری خەڵکی شارەزای گوند کردوویانە، چەندین پارچە گۆزە و ئامێری بەردینی شوێنەواری لە چەند شوێنێک دۆزراونەتەوە، کە بەڵگەی شوێنەوارییی و کۆنی ژیانی ئەم گوندە دەسەلمێنن



**جێگا شوێنەوارییەکان:**

**گردی قەڵاگە:**



**گردی قەڵاگە**

بە گرنگترین شوێنەواری گوندەکە دادەنرێت کە تائێستا دۆزرابێتەوە، جێگاکەی کەوتووەتە بەشی ڕۆژهەڵاتی گوندەکە بە دووری (7کم). شوێنەوارەکە بەشێکی لەسەر تەپۆڵکەیەکی تاوێرە بەردی سروشتییە، دەڕوانێت بەسەر چەمی قەڵاگە، کە وەک شورایەکی سروشتی وایە بۆ شوێنەوارەکە، بەشەکەی دیکەی کە گڵێنە و کەرەستەی شوێنەواری تێدایە، ڕووی پێشەوەی ڕاستەوخۆ ڕووە و گوندەکەیە و بریتییە لە گردێکی شوێنەواری. تاڕادەیەکی زۆر دەکرێت گریمانەی ئەوە

بکرێت ئەو خەڵکەی لەم شوێنەدا ژیاون، بەمەبەست ئەم گرد و گویَ چەمەیان هەڵبژاردووە، بەوپێیەی جێگایەکی ستراتیژییە، چونکە گردە سروشتییەکە بەرزتر بووە لە زەوییەکانی دەوروبەریی و زەوییەکە بەهێزتر و بڵندتر بووە بۆ نیشتەجێبوون، هەروەها نزیکە لە سەرچاوەی ئاوێکی باش.

پاش گەڕانێکی ورد توانرا کۆمەڵێک پارچە گۆزە و ئامێری بەردین بدۆزرێتەوە، کە کەرەستەی بەکارهاتووی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤی کۆن بوون، ئەم پارچە گۆزە و بەردانە بەپێی جۆر و پێکهاتەکەیان بەڵگەی ئەوە دەدەن بەدەستەوە کە ئەم گردە بۆماوەیەکی زۆر مرۆڤی تێدا ژیاوە. دیواری بەردین و هەبوونی پارچە خشت لەسەر گردەکە ئاماژەی ئەوە بەدەستەوە دەدات کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی ئیسلامی یان میرنشینە کوردییەکانی ناوەڕاست بگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەری بەهێز ئەوەیە بەشەکانی ژێرەوەی بۆ سەردەمی پێش زایین بگەڕێتەوە.

نزیکەی (50)مەتر نزیک لەم قەڵایە، شوێنێکی دیکە هەیە و بە (ئۆردوگا) ناسراوە، کە زیاتر قشڵاخ و کەلاوەیە، دەتوانین بڵێن، ئەم دوو شوێنەوارە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، سەردەمانێک بەشێک لە دانیشتوانی سەر گردەکە یاخود بڵێین ناو قەڵاکە لەو شوێنەدا ژیاون کە ئێستا پێی دەوترێت ئۆردوگا، وشەکەش تورکییە و ڕەنگە بۆ سەردەمی عوسمانییەکان بگەڕێتەوە.

به دووری کەمتر لە (400 مەتر) لە قەڵاگە و ئۆردوگاوە گۆڕستانێک هەیە، کە بە گۆڕستانی شێخ حەوشێ ناسراوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیسلامی، هەموو گۆڕەکانی ڕوو لە قیبلەن، کێلی گۆڕەکانیشی لە بەردی سروشتی ناوچەکەوە وەرگیراوە، هیچ یەکێک لە کێلی گۆڕەکان نەتاشراوە و ئامادە نەکراوە تا نووسین یان هێمای لەسەر بنەخشێنرێت.
بەهۆی بەکارهێنانی زەوییەکانی دەوروبەری قەڵاگە بۆ کشتوکاڵ، بەشی هەرە زۆری تێکچووە و داڕووخاوە، بەوهۆیەشەوە دۆزینەوەی نەخشە بنەڕەتییەکەی ئەستەمە، هەرچەندە لە بەشی خواریشەوە هەندێک پاشماوەی دیوار هەن، کە ڕەنگە پاشماوە و درێژکراوەی قەڵاکەی قەڵاگە بن، بەڵام بەبێ کاری کنە و پشکنین ناتوانرێت هیچ شتێک لەسەر پێکهاتەی قەڵاکە بوترێت.

**گرنگی هەڵکەوتەی شوێنی قەڵاگە:**

بەهۆی بەرزی شوێنی قەڵاگەوە بە پلەی یەکەم، پاشان بەهۆی ئەوەی لە سێ لایەوە بواری سەرکەوتنی نییە، بە سروشتی سێ لای کەندەڵانە و سەرکەوتن پێیدا ئەستەمە، ئەم هەڵکەوتە جوگرافییە لە نیشینگەی کۆندا چ سەربازی بووبێت یان نیشینگەی ئاسایی، زۆر گرنگ بووە، چونکە دروستکردنی شورای کەمتر پێویست بووە، هەروەک پارێزگاری کەمتریشی پێویست بووە.
کەرەستەکانی قەڵاکە:

ئەو مادده و کەرەستانەی لە دروستکردنی قەڵاکەدا بەکارهاتوون سروشتین و هی ناوچەکە خۆیەتی، کە بریتین لە بەرد، خشت و قسڵ کە لە دروستکردنی دیوارەکەدا بەکارهاتوون، بەهۆی نەمانی سەقفەکەیەوە، دڵنیانین چۆن سەری گیراوە، بەڵام بەراورد بە هاوسەردەمەکانی و شوێنەوارەکانی تری کوردستان، قەڵاکان و خانووەکان دارەڕا کراون لەو کەرەستە و دارانەی کە لە ناوچەکە بەردەست بوون، ئەم کەرەستانەش لە مێژووی کوردستان و عێراقی کۆندا بەکارهاتون.[407]

پێوانەی بەشێک لە دیواری قەڵاکە دەریدەخات، دیوارەکەی (50 سم) پانە، بە خڕە بەردی تاڕادەیەک گەورە دروستکراوە، لەکاتێکدا ناوکەشی دیوارەکە بە زیخ و وردە بەرد و قسڵ پڕکراوەتەوە.

---

([407]) حسن حمید محمد، البيت العراقي في العصر العثمانی عناصره المعمارية والزخرفية. رِسالة ماجستير غير المنشورة. بغداد. 1982.



کەلاوەکانی سەر قەڵاگە

**مێژووی قەڵاگە:**

بۆ دەستنیشانکردنی مێژووی شوێنەوارەکە ناچارین پشت بە دوو جۆر کەرەستەی دۆزراوە ببەستین، کە یەکەمیان پارچە گڵێنە دۆزراوەکانی قەڵاکەیە، چونکە گڵێنەکان کەرەستەی بەردەستی ڕۆژانەبوون بەزۆری لەهەمان ناوچەی بەکارهێنان دروستکراون، هەر لەبەر ئەوەشە لە زانستی شوێنەوارناسیدا بۆ زانینی تەمەنی شوێنەوارەکان زۆرتر پشتی پێدەبەسترێت، بەتایبەت بۆ ئەو ناوچانەی کە بۆ سەردەمی پاش گڵێنەسازی دەگەڕێنەوە،[408] کەرەستەی دووەمیش، بریتییە لە ئامێرە لە بەرد دروستکراوەکان، ئامێرە بەردەکان کە بۆ بڕین بەکارهاتوون پێش دۆزینەوەی

---

([408]) بصمه جی، فرج. بحث في الفخار صناعته وانواعه في العراق القديم. سومر. مجلد4، عدد 1. 1948. ص16.

کانزاکان، بەڵام پاش بەکارهێنانی کانزاکان بەگشتی و بەتایبەت پاش ناسینی بەکارهێنانی ئاسن(١١٠٠پ.ز) لە میسۆپۆتامیا و ناوچەکانی چیاکانی زاگرۆس بەکارهێنانی بەرد وەک ئامێر ڕووی لە داکشان کرد .[409].

ئەو پارچە شوێنەوارانەی لە قەڵاگە کۆکراونەتەوە ئەگەر بەراورد بکرێن بە هاوشێوەکانیان لە ڕاپۆرت و بڵاوکراوە شوێنەوارییەکانی تیمە عێراقیی و بیانییەکان لە ناوچەکانی تری کوردستان، ئەتوانین بڵێین بەشی سەرەوەی شوێنەواری قەڵاگە بۆ سەردەمی ئیسلامی دەگەڕێتەوە، پاشان چینەکانی خوارتر بۆ سەردەمەکانی وەک ساسانی و ئاسن، بەڵام بەهۆی دۆزینەوەی کرۆکی بەرد، کە ئامێری بەردی لێ دروستکراوە، ئەو بۆچونە بەهێزترە کە شوێنەواری قەڵاگە بەگشتی بگەڕێتەوە بۆ سەردەمەکانی پێش ئاسن، دەتوانین بڵێین بۆ سەردەمی کالکیۆلیسیک واتە چاخی بەردینی کانزایی[410].

---

([409]) الجبوري، م.م.رغد جمال محمد غريب. عصور ماقبل التاريخ في بلاد الرافيدين. ط.1. بغداد2017. ص 24_30.

(410) ئەم ئەنجامگیرییە لەسەر مێژووی قەڵاگە جگە لە ئەزموونی ڕووپێوی خۆمان، بۆچوونی زۆرێکی تر لە شوێنەوارناسانە کە پرسمان پێکردوون و ڕوونکردنەوەمان پێداون لەبارەی کەرەستە و قەڵاکەوە، ئەوانیش بریتین لە: شوێنەوارناس زوهێر ڕەجەب کە خاوەنی زیاتر لە ٤٠ ساڵ کاری کنەوە و پشکنینی شوێنەوارییە، شین نیشییاما کە شوێنەوارناسێکی یابانییە و ئەزمونێکی نێودەوڵەتی هەیە لە ناسینەوەی گڵێنە بەتایبەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، سیمۆنە میوڵ مامۆستایە لە زانکۆی میونخ لە ئەڵمانیا و شوێنەوارناسێکی چالاکی بواری گڵێنە و پاشماوە شوێنەوارییەکانەو ئەزموونی زیاد لە 10 ساڵ کاری مەیدانی لە کنە و

**پاشماوە شوێنەوارییەکان:**

پارچەکان بریتین لە: پارچەی گۆزەی شکاو، کوپەی شکاو، ئامێری بەرد و خشتی سوورەکراو. زۆرێک لەو پارچانە بریتین لە پارچەی ئەو کۆپە گەورانەی خواردنی تێدا هەڵگیراوە، ئەوەی لە هەمووی گرنگترە ناوخۆیی بوونی پارچەکانە، واتە هەریەکە لە گۆزە و دیزانەکە لە خودی ناوچەکەدا دروستکراون بەتایبەتی دەوروبەری قەڵاکە و هاوردەکراو نین.

لە پێکهاتەی گۆزەکاندا وردە بەرد و زیخ هەیە، بەڵام ئەوەی لێی دڵنیاین ئەوەیە کە ئەو گڵێنە و دەفرانەی لە قەڵاگە دۆزراونەتەوە لە دروستکردنیاندا ئامێری دووچەرخە بەکارهاتووە. واتە قۆناغێکی پێشکەوتووە لە دروستکردنی گڵێنەکان بەپێی زانستی شوێنەوارناسی.

ئەمانەی خوارەوەش وێنەی گڵینە و ئامێرە بەردینەکانی قەڵاگە و بەراوردکردنیانە بە هاوشێوەکانیان کە لە شوێنەوارەکانی تری کوردستان دۆزراونەتەوە:

---

پشکنین و ڕووپێویی هەیە لە کوردستاندا، مستەفا ئەحمەد کە کوردێکی ڕۆژئاوایە و خوێندکاری دکتۆرایە لە فەڕەنسا و تایبەتمەندە لە گڵێنەی سەردەمی ئیسلامی، لەگەڵ دکتۆر عەبدوڵڵا زەندی، مامۆستا لە بەشی شوێنەواری زانکۆی سەلاحەدین کە توێژینەوەکانی بەشی زۆری لە بواری گڵێنەناسیدایە.




بەراوردی نێوان دوو پارچە گڵێنەی سەردەمی ئاسن. وێنەی ژ(١) پارچە گڵینەیەکە لە گردی سەید ئەحمەدان لە قەڵادزێ لەلایەن تیمی زانکۆی سکوبای یابانییەوە دۆزراوەتەوە تەمەنی بۆ سەردەمی ئاسن گێڕراوەتەوە [411] وێنەی ژ(٢) وێنەی پارچە گڵینەیەکی گردی قەڵاگەی گڵێجاڵە. ئەم جۆرە گڵێنانە بە لێوار ئەستور thickened rims ناسراون.

---

(411) Akira Tsuneki at el. Excavation at Qalat Siad Ahmadan, Slemani, Iraqi – Kurdistan: First Interim Report (2014 Season). AL–RĀFIDĀN Vol. XXXVI 2015. Pp. 34–36.

بەراوردی نێوان هەندێ گڵێنەی سەردەمی ئاسن لە قەڵاگە(2.1) لە گەڵ هەندێک گڵینەی سەردەمی ئاسن گردی سەید ئەحمەدانی قەڵادزێ (٣) .[412]



2

بەراوردی نێوان هەندێ گڵێنەی سەردەمی برۆنز لە قەڵاگە(2) لە گەڵ گڵینەیەکی سەردەمی برۆنز کە لە گردی شەکر تەپەی شارەزوور دۆزراوەتەوە وێنەی (١) .[413]

---

([412]) Akira Tsuneki at el. Excavation at QalatSiadAhmadan, Slemani, Iraqi – Kurdistan: First Interim Report (2014 Season). AL-RĀFIDĀN Vol. XXXVI 2015. Pp.34-36.

([413]) Takahiro Odaka. Excavations at ShakarTepe 2019.Unpublished Report.P.24.



بەراوردی نێوان وێنەی کرۆکی بەرد (واتە کوتلە بەردێک کە بەهۆی پیاکێشانەوە تەلاشە بەردی لێدروستکراوە بۆ بڕین وەک چەقۆ) وێنەی یەکەم لە گردی تلکی لە باشووری ڕۆژهەلاتی بەنداوی وان دۆزراوەتەوە بۆ سەردەمی حەلەف دەگەڕێتەوە (٤٥٠٠ پ.ژ) [414]، وێنەی دووەم کرۆکە بەرد لە قەلاگەی گلێجاڵ دۆزراوەتەوە.

(414) Matthews Roger. The Early Prehistory of Mesopotamia 500,000 – 45000 bc. Subarto V. Brepols. 2000. Pp 104-105






وێنەی (١) بەردە چەقۆی سەردەمی بەردینی نوێ لە شەکر تەپە دۆزراوەتەوە، [415] وێنەی (٢) بەردە چەقۆ لە قەڵاگە دۆزراوەتەوە، هەر لە گردی شوێنەواری تانجەرۆی شارەزوور هەمان بەرد دۆزراوەتەوە کە بۆ هەمان سەردەم دەگەڕێتەوە [416].

---

([415]) Takahiro Odaka. Excavations at ShakarTepe 2019.Unpublished Report.P.21.

([416]) Saber A., Salah Sleman, Kamal Rashed, Simone Mühl,Tow salvage excavation in Southern Kurdistan Sulaymaniyah Iraq(Tell Tanjaro season 2008) and (Tell Greza season 2003), Mitteilungen der Deutschen Orient-Gesellschaft zu Berli, Germany 2014, p. 155.



گرێژنەی دەرگا، ئەم بەردانە لە بن داری دەرگاکان دانراون بۆئەوەی لەکاتی کردنەوە و داخستنی دەرگاکە لە شوێن خۆی بوەستێت، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات و بەهۆی زۆری بەکارهێنان ناچار بەردەکە هەڵ ئەگەڕایەوە، پاش بەکارهێنانی ئەم دیو ئەو دیو کون ئەبوون و جارێکی تر

بەردێکی نویَ لە جێگایان دادەنرا. ئەم تەکنیکە لە زۆربەی سەردەمەکاندا بەکارهاتووە و ئەستەمە بتوانین سەردەمی بەکارهێنانی بزانین، لەلایەکی دیکەوە لەبەرئەوەی لە شوێنی خۆیدا نەماوە بەهۆی کێڵانەوە چینەکەی ونبووە، ئەوەش دیسان وایکردووە کە نەتوانین هیچ سەردەمێک بۆ ئەم ئامێرە دیاری بکەین.



ئەو دوو وێنەیە دوو دیوی یەک ئامێرن زۆر پیَ ئەچیَ کە قاچی کوانو بیَ، زۆربەی جار کوانو بەکارهاتووە بۆ دانانی خەڵوز لەناوماڵەکاندا.



پارچە خشتێک لە قەڵاگە دۆزراوەتەوە.



وێنەی چەند پارچە گۆزەیەکی سەردەمی ئاسن، واتە نزیک ١٠٠٠ پ.ز. قەڵاگە



سێ پارچە گڵێنەی سەرەوە لە سەردەمەکانیان دڵنیانین بەهۆی بچوکیانەوە، بەڵام پێ دەچێت ساسانی بن، ڕیزی دووەم سەردەمی ئاسنن.

**گڵێجاڵە بچکۆلە(بچکەلە)**

گڵێجاڵە بچکۆلە یەکێکی ترە لەو ناوچانەی گڵێجاڵ کە پاشماوەی شوێنەواری تێدایە و بەشێکی بنەڕەتییە لە گوندەکە، لەبارەی ناوەکەشیەوە کە هاوتای ناوی گڵێجاڵە چەند گریمانەیەک هەن، دەکرێت نزیکی سروشتەکەی بێت لە سروشتی گوندەکە خۆی کە بە شاخ دەورە دراوە، ئەمیش پێدەشتێکی بچووکە هاوشێوەی گوندە بنەڕەتییەکە، یان ئەوەیە بەهۆی گەرمیان و کوێستان کردنی خەڵکی ئاواییەوە لە وەرزەکانی ساڵدا لە وەرزێکدا ئەم پێ دەشتە لەباربووبێت بۆ هەوارگە و ماویەک لەوێدا مابنەوە، ئیتر بە بچوککراوەی گوندەکەیان دانابێت، یان دەکرێت لە سەردەمێکدا ئەویش گوند و هەوارگە بووبێت هاوشێوەی گڵێجاڵ لە تەنیشت و لە نزیکی ئەودا.

## قەڵای گلێجاڵە بچکۆلە

ئەوەی تایبەتە بە قەڵای گڵێجاڵە بچکۆلە، شتێکی وەهای نەماوەتەوە، ئەوەی هەیە بریتییە لە پاشماوەی دیوارەکە و بەردەکانی بەو ناوەدا بڵاوبووەتەوە، شوێنی قەڵاکە زۆر لە بارە و دەڕوانێت بەسەر شوێنەکانی دیکەی ناوچەکەدا و لەسەر کۆتایی بەرزاییەکی تاڕادەیەک مامناوەند دروستکراوە.

گرنگی ئەم قەڵایە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کانی و ئاو لە تەنیشتەکانییەوە هەیە، پاشان لە بەشی خوارەوە کاتێک دەڕۆیت بۆ قەڵاکە لە سێ لایەوە سەرکەوتن پێیدا ئەستەمە. ڕووپێوی قەڵاکەش دۆزینەوەی چەند پارچە گۆزەیەکی لێکەوتەوە کە سەلمێنەری هەبوونی ژیانن لەو جێگەیەدا لە دێر زەمانەوە. پاش کۆکردنەوەی ئەو پارچانەش، دەرکەوت لێکۆڵینەوە لە مێژوویان قورسە، چونکە پارچە گڵێنەکان سەر و بنیان نەماوە، هیچ ڕەنگێکیان لەسەر نییە کە لە ڕێگەیانەوە بتوانرێت تەمەنی گۆزەکان دیاری بکرێت، ئەوەش وایکردووە دیاریکردنی سەردەمی ژیانی ئەم شوێنەوارە ئەستەم بێت، بەڵام ئاماژەکان ئەوە دەردەخەن بۆ سەردەمی ئیسلامی بگەڕێتەوە، واتە تەمەنی ژیان لە بەشەکانی سەرەوەی شوێنەواری گڵێجاڵە بچکۆلە دەوروبەری هەزار ساڵێکە.



**قەڵای گلێجاڵە بچکۆلە**

پاش هەڵگرتن و پاککردنەوەی پارچەکان و وردبوونەوە لە شوێنەوارەکانی قەڵاکە لە وەرزی جیاجیا[417] گەیشتینە ئەو بڕوایەی پارچەکان بۆ سەردەمی (هیلینیستی، پارثی _ ساسانی(651پ.ز _224 ز) دەگەڕێتەوە، هەردوو شوێنەوارناس (خاتوو سیمۆنە میول و مستەفا ئەحمەد) کە شوێنەوارەکانیان دیووە هەمان ئەنجامگیرییان پشت ڕاست کردەوە.

---

([417]) لە چەند وەرز و کاتێکی دیکە سەردانی شوێنی قەڵاکە کراوە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەتایبەت لە هاوینی 2020 دا، ئەو پارچانەشی دۆزرانەوە، دوای هەڵگرتن و پاککردنەوەی بە هاوکاری بەشی ستۆدیۆی مۆزەخانەی سلێمانی وێنەی پارچەکان لەلایەن شوێنەوارناس (هێمن نوری فەتاح) گیران بۆ لێکۆڵینەوەکە.



گڵێنەی قەڵای گڵێجاڵە بچکۆلە

## باخی ئەلیاخە

دەکەوێتە خوارەوەی  گوندەکەوە و چەند کیلۆ مەترێک لە شوێنەواری گەچێنەوە دوورە، هەروەها لە نزیک ئەم شوێنەوارەوە گۆڕستانێک بە هامان ناوەوە هەیە، لەم جێگایە کە بە پوش و زەمەن داپۆشراوە، چەند پارچەیەکی

شوێنەواری دۆزرانەوە، یەکێک لەو پارچانە جێگەی بایەخ و گرنگی بوو، چونکە ڕەنگێکی پرتەقاڵی کاڵی هەبوو.



پارچە گۆزەکانی باخی ئەلیاخە:

بە بۆچوونی شوێنەوارناس، خاتوو سیمۆنە موهی، ئەم ڕەنگە پرتەقاڵییە کاڵەش تایبەتمەندی ڕەنگی کورەی ناوچەکەیە، ئەگەریش زیاتر ڕوونی بکەینەوە مەبەست ئەو ڕەنگە سروشتیەیە کە لە خاکەکەوەیە خۆی ڕەنگیکی پرتەقاڵی باوی هەیە لە فڕنانی گڵینەکەش ڕەنگەکە ون ناکات و دوای ئەوەش هەر وەک خۆی دەیهێڵێتەوە.

بەپێی ئاماژەکانیش سەردەمی گڵینەی باخی ئەلیاخەش بۆ سەردەمی چاخی بەردینی کۆن، هیلینستی - پارثی (232 _ 146 پ.ز)، ئیسلامی دەگەڕێتەوە.

**گۆڕستانەکان:**

لە گوندی گلێجاڵدا چەندین گۆڕستانی جیاجیا و دوور لە یەکتر هەن، هەندێک لەوانە پاشماوەی میللەتانی پێش ئاواییەکەی ئێستان، گرنگترین ئەو گۆڕستانانەش ئەمانەن:

**- گۆڕستانی بان مەیدان**

دەکەوێتە پشتی گڵێجاڵەوە لە بناری چیای خۆشک، بەهۆی کۆنی و تێپەڕبوونی کاتەوە زۆرێک لە کێلەکانی شکاون و کەوتوون، کێلی یەکێک لە گۆڕەکانی ئەم گۆڕستانە هێمایەکی لەسەرە کە لە هیچ گۆڕستانێکی تری ئاواییەکەدا نییە، گۆڕەکە لە بن دارێکی گەورەدایە و بە بەرد و وشکە کەڵەک پەرژینێکی بۆ کراوە، قەبارەی کێلەکە زۆر گەورە نییە، جۆری بەردەکەشی هەمان جۆری بەردەکەیە کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، واتە هاوشێوەی کێلی قەبرەکانی دیکەیە.

(بان مەیدان) وشەیەکی لێکدراوە و لە دوو بڕگە پێکهاتووە، یەکەمیان بەمانای بەرز یاخود بڵند دێت، بڕگەی دووەمیش کە (مەیدان)ە، زیاتر شوێنی ڕمبازیی و گۆڕەپان و تەختاییە، شوێنی گۆڕە جیاوازەکەش هەرچەندە لەسەر شاخەکەیە بەڵام شوێنێکی تەخت و فراوانە، جۆری بەردەکەشی سروشتییە و لە بەردی ناوچەکە خۆیەتی، گۆڕەکانی تریش وەک خۆیان نەماون و بەهۆی داخوران و کەشوهەواوە فەوتاون و زیانی زۆریان پێ گەیشتووە.

**سەردەمی گۆڕەکان؛**

هێما و نوسین: ئەوەی لەسەر گۆڕەکان بێت تەنها هێمای بازنەیەکە، لە بەشی خوارەوەی هێڵێکی درێژ هەیە، ئەمیش وەک هێمایەکی سادەیە و لەوانەیە بۆ ناسینەوەی خاوەن گۆڕەکە کرابێت، بۆ ئەوانەی دواتر سەردانی دەکەن، ئەم جۆرە ئاماژانە زیاتر بۆ کەسایەتی ئایینی گەورە دەکرێت و زۆرجاریش حەوشە یان پەرژینی بۆ دەکرێت، تا بناسرێتەوە، ئەم حاڵەتەش لە سەرەتاکانی سەردەمی ئیسلامی پەیڕەو کراوە.

قەبارەی کێلی گۆڕەکە: درێژی گشتی گۆڕەکە بریتییە لە (110سم)، بەڵام درێژی کێلەکە تەنها (37سم)ە و پانییەکەشی (17سم)ە، کێلەکە تائێستا هیچ ڕووپێویی و کنەکردنێک پێی نەگەیشتووە هەتا بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەی شوێنەواریی.



هێمای سەر کێلێک لە گۆڕستانەکە

سێیەم ـ پاشماوە شوێنەوارییەکانی دیکەی گوندەکە:

دوای گەڕانەکانمان بۆ دۆزینەوەی پاشماوەی شوێنەواری دیکە لە سنووری گوندەکە لە شێوەی گرد و قەڵا و گۆڕستان، بۆمان دەرکەوت چەندین گۆڕستان و گۆڕی دیکە هەیە کە زۆرینەیان دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی ئیسلامی، بەوپێیەی گۆڕەکان ڕوو لە قیبلەن و بە دەستووری ئیسلامی نێژراون.

لە پشتەوەی گوندی گڵێجاڵ باخێک هەیە بە ناوی باخەکەی (مامۆ حەمەصاڵح) لە سەروو باخەکەوە بەهۆی لافاوەوە دەستاڕێکی گەورە دەرکەوتووە کە شوێنەوارییە، تا ئەم ساڵانەی دواییش دەیان بەردی کوتینی دانەوێڵە (بەردە دن) لە گوندەکەدا هەبووە، بەڵام بەهۆی بیناسازی سەردەم و فراوانبوونی ئاواییەکەوە بەردە دنەکان و دەستاڕەکانیش هیچیان نەماون.



بەردە دەستاڕ

ئەم بەردە دەستاڕە زۆر گەورەیە و جێگیرکراوە لە زەویدا، تەنها بە ئامێر یان داڕمانی سروشتی جوڵاوە، واتە ئەم بەردە بەردی بنەڕەتیی و بنکەی دەستاڕەکەیە، کونەکەی دەکەوێت سەنتەری بەردەکە و لەوێشەوە بۆ لێوارەکانی بە هەرلایەکدا (30سم) دەبێت.

**شوێنەواری گەچێن**



**گەچێن:**

گەچێن شوێنێکی ستراتیژیی و گرنگی گوندەکەیە و وەک خەڵکی ئاوایی دەڵێن" ڕیشە و بنچینەیە"، چونکە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی گوندەکە لە کۆن و نوێشدا لە کانییەکەوە هەڵدەقوڵێت کە لەم شوێنەدایە، سەرباری ئەوەش بۆ

کشتوکاڵ و تەڕەکاڵ بەکاردێت و سەردەمێک باخی زۆر و بەرهەمهێنانی برنجی لێکراوە و چەڵتوکەکەی خاوەن ناوبانگی خۆی بووە بەهۆی فێنکی ئاوەکەیەوە.
لە گەچێندا پاشماوەی گۆزە لە لوتکە یان قوتی گەچێن هەیە، هەروەها لە (بان مەیدان) گۆڕستان هەیە، لە دووری 500 مەترەوە، ئەوەش تاڕادەیەکی زۆر ئەو گومانە ناهێڵێت کە لە ڕابردوودا لەو جێگەیەدا نشینگەیەکی شوێنەواری هەبووە.



**پاشماوەی گۆزەکانی گەچێن**

دوای کۆکردنەوەی پارچە گۆزەکانی دەوروبەری کانیاوی گەچێن و ناو کەلاوە بەردەکانی، چەند پارچە گۆزەیەکی ترمان دۆزییەوە، کە یەک دوو دانەیان نەخشدار بوون، هەروەها بەردێک دۆزرایەوە کە لە ناوەڕاستیدا کونێک هەیە، بەڵام بەشێکی شکاوە تەنها بەشێکی کەمی ماوەتەوە، سەرەتا

گومانی گێژەنەی دەرگای لێکرا، بەڵام بەراورد بەو پاشماوانەی هاوشێوەی لە ڕووپێوی شوێنەواری لە شارەزوور بینراوە بەتایبەت لە گردی شاملو و گردەکانی دیکە، دەرکەوت لە ئامێری بەردین دەچێت کە بۆ پێداویستی ڕۆژانە بەکارهێنراوە. دوای هەڵگرتن و توێژینەوەش لە بەردەکە دەرکەوت کۆی پارچەکان بۆ سەردەمی جیا جیا دەگەڕێنەوە، بەتایبەتی سەردەمی چاخی بەردینی کۆن درەنگ یان دواکەوتوو (Late Calcolithtic)، ساسانی، ئیسلامی[418].



وێنەی بەردەکە

([418]) چاوپێکەوتنی شوێنەوارناس د. سیمۆنە میول. 23.7.2020.

# بەشی شەشەم
# جوگرافیای شارەدێی گڵێجاڵ

د. تەحسین عەبدولڕەحیم عەزیز



هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە زانستی جوگرافیا، پرۆفیسۆری یاریدەدەرە لە بەشی جوگرافیای کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین (هەولێر)، چەند توێژینەوەیەکی لە گۆڤارە زانستییەکاندا بڵاو کردووەتەوە کە هەندێکیان مەیدانین.

## هەڵکەوتەی جوگرافی:

شارەدێی گلێجاڵ سەنتەری ناحیەی بەمۆیە، ئەم ناحیەیە یەک لە ناحیەکانی قەزای ناوەندە لە پارێزگای هەڵەبجە، دەکەوێتە بەشی باشووری خۆرهەڵاتی هەرێمی کوردستان و باشووری پارێزگای هەڵەبجە، ناحیەی بەمۆ بێجگە لە سەنتەری ناحیە (گلێجاڵ) لە چەند گوندێکی دیکە پێکدێت کە ئەوانیش بریتین لە: (بەلەسۆ، گمە، قەلب، پشتە، بەڕوێن، چواردارانی سەروو، چواردارانی خواروو، کانی وەیسکێ، کانی پاشا، تۆوشکێ، حاجیاوا، سەعداوا). نەخشەی(1)

شارەدێی گلێجاڵ لەڕووی ئەسترۆنۆمییەوە دەکەوێتە سەر بازنەی پانی ("59 '58 °34) ی باکوور و هێڵی درێژی ( °45 "00 '48)ی ڕۆژهەڵات. ئەم شارەدێیە لە دامێنی باشووری چیای خۆشک هەڵدەکەوێت، لە دۆکۆمێنتە فەرمییەکانی تایبەت بە زەوی وزار کەرتی (46) پێکدێنێت، کە بریتییە لەو زەوییانەی خاوەندارێتیان بۆ دانیشتوانی ئەم گوندە دەگەڕێتەوە، ڕووبەری ئەم کەرتە نزیکەی (10777) دۆنمە. نەخشەی (2).

گلێجاڵ لە باکوورەوە هاوسنورە لەگەڵ گوندی قەڵپ، لە باکووری ڕۆژهەڵات لەگەڵ گوندی گمە. لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی گوندی پشتە هەڵەکەوتووە، لە بەشی باشوور و باشووری ڕۆژئاوا هاوسنورە لەگەڵ گوندی بەلەسۆ، لە بەشی ڕۆژئاوا هاوسنورە لەگەڵ ناحیەی مەیدانی قەزای خانەقین. سنوری زەوییەکانی شارەدێی گلێجاڵ لەگەڵ هەریەک لە گوندەکانی دەوروبەری بەمشێوەیە جیادەکرێتەوە: نەخشەی (3).

ـ سنور لەگەڵ گوندی قەڵپ: لە باکووری خۆرئاوا لە لوتکەی باڵەکەڕێ لە چیای خۆشک دەستپێدەکات، بە ئاڕاستەی باکووری خۆرهەڵات بەم شوێنانە تێدەپەڕێت (تاوگەکەی سەرهاڵ، شانی بڵاڵوکەکان، نەزەرگەکە، کوڵەبەرز، کوڵەی جۆجار، گەڕاوەکەی سەعداوا، پەلی کەڵەکە، شانی قوڵقوڵە)، لە گاهەڵدێر کۆتای پێدێت و دەگاتە سنوری گڵێجاڵ لەگەڵ زەوییەکانی گمە.

**ـ سنور لەگەڵ گوندی گمە:** لە باکووری گڵێجاڵ لە ئاوڕێژی تارمشێر بە ئاڕاستەی خۆرهەڵات درێژدەبێتەوە، پاشان بە ئاوڕێژی پێچکەبزن تێدەپەڕێت تا دەگاتە سەر چەمی گەڕاو.

**ـ سنور لەگەڵ گوندی پشتە:** لە خۆرهەڵات دەستپێدەکات لەگەڵ ڕێڕەوی چەمی پشتە درێژدەبێتەوە تا قەبرسانی مچەباشە، پاشان بە ئاڕاستەی باشوور بە شانی بومەسڵێ هەڵدەکشێت تا دەگاتە لوتکەی بومەسڵی، بەشانی خواری گڵێجاڵە بچکۆلە درێژدەبێتەوە تا لە نزیک قوتی بلێڵان دەگاتە سنوری گوندی بەلەسۆ.

**ـ سنوری لەگەڵ گوندی بەلەسۆ:** ئەم سنورە لە باشوورەوە لە یاڵەقووچ و چەمی سۆڵەکاتەکەوە درێژدەبێتەوەتا قوتی بلێڵان و پاشان گۆڕستانی ڕەحمان مردوو بۆ لوتکەی چیاخوگان و شۆڕ دەبێتەوە بۆ ملەکەوەلە.

**ـ سنوری لەگەڵ ناحیەی مەیدان:** لە لوتکەی خۆشک لە باشووری خۆرئاوا درێژدەبێتەوە بۆ باکووری خۆرئاوا بە هەریەک لە لوتکەکانی ملە گورگان و لوتکەی هۆرەکە و ملەی ئەسحاب تێدەپەڕی تا لە لوتکەی باڵەکەڕێ کۆتای پێدێت.

**جیۆلۆجیا:**

لەڕووی تەکتۆنییەوە ناوچەی گڵێجاڵ دەکەوێتە زۆنی نوشتاوە بەرزەکان (High folded Zone) لە ناوچەی لێواری ناجێگیر کە جوڵەی ئەلپی بەشێوەیەکی بەهێز کاری تێکردووە، ناوچەکە بە ستونێکی چینە بەردی ئەستور داپۆشراوە کە نیشتووی گۆماوی قوڵی سەردەمە جیولوجیە جیاوازەکانە [419].

بەدواییەکدا هاتنی سەردەمە جیۆلۆجیە جیاوازەکان لە پێکهاتەی چینە بەردە دەرکەوتووەکانی ڕووی ناوچەکە بەدیار دەکەوێت. کۆنترین چینە بەردەکانی ناوچەکە بە پێکهاتەی کۆمیتان دەستپێدەکات لە چاخی کریتاسیدا نیشتووە لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوچەکە وەک پشتێنەیەک لە باکوورەوە بۆ باشوور بەدەردەکەوێت، بەهەمان شێوە چینەبەردەکانی چاخەکانی دوای ئەو بەدوای یەکدا دێن بە ئاڕاستەی ڕۆژئاوا تا دەگاتە لوتکەکانی چیای خۆشک. چینە بەردەکان بە پێکهاتەی پیلاسپی – سنجار کۆتایی پێدێت، مێژووی نیشتەنی ئەم پێکهاتە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی پلایوسینـ ئیوسین. بەهۆی جیاوازی چینە بەردەکان لەڕووی پێکهاتەی کانزایی و بەردیی و جیاوازی پلەی ڕەقییەتی ڕادەی بەرگریان بۆ پرۆسەکانی ڕامالین و کەشکاریی و ڕوداوە سروشتییەکان جیاوازە، ئەمەش بووەتەهۆی

---

([419]) کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ، جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، چاپی یەکەم، کتێبی سەنتەری برایەتی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان، هەولێر، 1998، لا 33.

دروستبوونی بەرزونزمییەکی ئاڵۆز و جیاواز لە ناوچەکە، چینە ڕەقە بەهێزەکان  بەشێوەی چیا و گرد و بەرزایی دەبینرێن. چینە بەردە بێهێزەکان دۆڵ و نشێوەکانیان دروستکردووە.

گرنگترین پێکهاتە جیۆلۆجییەکانی ناوچەکە بریتییە لەمانەی خوارەوە: نەخشەی (4)

1- پێکهاتەکانی چاخی کریتاس: ئەو پێکهاتانەی دەگەڕێنەوە بۆ ئەم چاخە لە ناوچەکەدا بریتییە لە هەردوو پێکهاتەی (کۆمیتان و شیرانش). ئەم دوو پێکهاتەیە بەشێکی فراوان لە ناوەڕاستەوە بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵاتی ناوچەکە دادەپۆشن. پێکهاتەی کۆمیتان لە چینی تەنکی بەردی (جیری) ڕەنگ کاڵ (بەلای سپیدا) پێکدێت.[420]

پێکهاتەی شیرانش بەشێوەیەکی سەرەکی چینەکانی لە بەردی کلس و هەندێک بەردی مارڵ پێکدێت و ڕەنگێکی سپی خۆڵەمێشی هەیە بەشەکانی سەرەوەی شێوەی پەڕاوی (وەرەقی) هەیە.[421]

2- پێکهاتەکانی چاخی پالیوسین - ئیوسین: لە پێکهاتەکانی ئەم چاخە (کۆڵۆش، چەرکەس و پیلاسپی - سەنجار) لە ناوچەکە بەدیار دەکەون. ئەم پێکهاتانە لە ناوەندی ناوچەکە بە

---

([420] ) دیار علی محمد المنمی، دراسة کیمیائیة وبیئیة للمیاه الجوفیة فی مدینة السلیمانیة وضواحیها، رسالة ماجستیر، جامعة بغداد، 2002، لا6.

(2) Youkhana.R.Y.and Sissakan, V.K. Stratigraphy of vol 9. no 3. Shaqlawa-Quwsanjaq area Geol-Soc-Iraq. Baghdad-1986-P143

ئاڕاستەی ڕۆژئاوا بەدوای یەکدا بەدەردەکەون. چینە بەردەکانی پێکهاتەی کۆڵۆش بریتییە لە لە بەردی لمی و بەردی قوڕی هەندێک جاریش لە کۆنکلۆمریەت پێکدێت، وێڕای بوونی ڕێژەیەک لە بە بەردبوون لەم پێکهاتەیە پاشماوەی جوڵەی گیاندارە ئاوییەکان بەدی دەکرێت لەسەر چینە بەردەکانی ئەم پێکهاتەیە.[422]
چینە بەردەکانی پێکهاتەی چەرکەس بریتییە لە بەردە هەڵوەشاوەکانی قوڕینە سورەکان، لە قوڕ و مارل لەگەڵ بوونی بەردی جبسی لە چینەکانی سەرەوەی پێکدێت.[423]
پێکهاتەی پیلاسپی پێکدێت لە چینە بەردی کلسی و دۆلۆمایتی کە ڕەنگی سپی مەیلەو زەردی هەیە. چینە بەردەکانی پێکهاتەی سنجار لە بەردی جیری سپی و خۆڵەمێشی دەوڵەمەند بە مادەی قوڕی پێکدێت.[424].

**بەرزونزمی:**

لەڕوی بەرزونزمییەوە ناحیەی بەمۆ دەکەوێتە ناوچەی شاخاوی پێچ سادەکان (چیا نزمەکان) ئەم ناوچەیە کەمتر کەوتووەتە بەر جوڵەی زەویی و چەمانەوەکانیان سادەیە لە زۆربەی شوێنەکاندا بە ئاڕاستەی باکووری ڕۆژئاوا بۆ

---

([422] ) مؤيد حسن جمعة-دراسة رسوبية لتكوين الكولوش في مناطق مختارة من شمال شرق العراق-رسالة ماجستر،جامعة بغداد،1992، لا 38.

([423] ) فاروق صنع الله العمرى، على صادق، جيولوجية شمال العراق، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، 1977، لا122.

([424] ) على محمود السورداشى، دراسة صخارية وسحنية وبيئية لتكوين سنجار فى مقاطع المختارة من منطقة السليمانية شمال شرق العراق، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين ـ اربيل، 1988، لا23.

باشووری ڕۆژهەڵات درێژدەبێتەوە، زنجیرە چیاكانی بەشێوەیەكی گشتی تەریب لەپاڵ یەكدا دەكشێن لە نێوانیاندا چەند دۆڵێكی درێژ و فراوانی ڕووچاڵی نارێک و پێک هەیە.[425]

ڕووی زەوی شارەدێی گلێجاڵ بەهۆی ئەوەی بەشی زۆری زەوییەكانی حەوزی چەمی گل پێكدێنێت، دەوروبەری ناوچەكە بە چیا و بەرزایی دەورە دراوە بەتایبەتی لە بەشەكانی باشووری ڕۆژئاوا و ڕۆژئاوا و باكوور و باكووری ڕۆژهەڵات، لەم ئاڕاستانە بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات زەوییەكان بەرەو نزمبوونەوە دەچن.

دیارترین و بەناوبانگترین زنجیرە چیا لەم ناوچەیە بریتییە لە چیای خۆشک، كە سنوری ڕۆژئاوای ناحیەی بەمۆ پێكدەهێنێت، ئەم چیایە بەشێكە لە درێژبوونەوەی چیای بەمۆ كە سەرتەكی بەمۆ لێكیان جیادەكاتەوە، لە باكوورەوە چیای خۆشک دەگاتە چیای زمناكۆ، ئەم چیایەش تا بەنداوی دەربەندیخان درێژدەبێتەوە.

شارەدێی گلێجاڵ دەكەوێتە بناری ڕۆژهەڵاتی چیای خۆشک، بەشێوەیەک ئەم چیایە و بارستاییە چیاییە درێژبووەكانی دەكەوێتە ڕۆژئاوا و باكووری ڕۆژئاوای گوندەكە. نەخشەی (5). ئەم چیایە یەک لە چیا بەرزەكانی ناوچەكەیە، بەرزترین لوتكەی دەگاتە (1620)م لە ئاستی ڕووی دەریا. سنوری شارەدێی گلێجاڵ بە چەندین لوتكەی ئەم چیایەدا تێدەپەڕێ

---

([425]) هاوڕێ یاسین محەمەدئەمین، لێكۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای هەرێمی كوردستان، چاپی سێیەم، چاپخانەی كاردۆ، سلێمانی، 2014، لا 63.

لەوانە لوتکەی باڵەکەڕێ (1172)م، ملەی ئەسحاب (1085)م، لوتەی هۆرەکە (1112)م، ملەگورگان (1020)م، لوتکەی خۆشک(1060)م. لە بەشی باکووری گوندەکەش چەند لوتکەیەک هەڵکەوتووە، وەک ملەونەزەرگەکە (795)م، ملەی کولەی جۆجار (785)م.

بارستاییە چیاییە درێژبووەکان لەم زنجیرە چیایە گرنگترین بەشی بەرزونزمی گوندەکە پێکدەهێنن، لەوانە بان مەیدان (1095)م، خۆرەتاو (1103)م، قولەی گوێرەکە هەڵدێر (1145)م، قولەی ژاڵەکە (1087)م، مستەخوان (820)م.

یەک لەو چیایانەی کە دەکەوێتە نزیگ گوندەکە لە باشوورەوە چیاخووانە کە بەرزییەکەی دەگاتە (1000)م، سنوری باشووری ناوچەکەش بە چەند لوتکە بەرزاییەکی تردا تێدەپەڕێ لەوانە، لوتەی بومەسڵی (787)م. لە بەرزای و گردۆڵکەکانی دیکەی ناوچەکە تەرزە کوت (900)م، تەپەی بارام (828)م، قوتی زەوی ڕەجەو (772)م، تەپی قادرییان (765)م. پاڵ کەوەلە (810)م و قوتی تەنگەکە (780)م.

لە بەشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوچەکە ئاستی بەرزی زەوییەکان نزم دەبێتەوە بۆ نزیکەی (600)م لە ئاستی ڕووی دەریا، بەشێوەیەک ڕووی زەوییەکە لە بەشەکانی باشووری ڕۆژهەڵات بەرزونزمی کەمترە و دەشتی گلێجاڵ پێکدەهێنێت، ئەم دەشتە لەگەڵ زەوییەکانی گڵێجاڵە بچکۆلە تاڕادەیەکی باش تەختن و لەبارن بۆ چالاکی کشتوکاڵ.

## سامانی ئاو

سەبارەت بە سامانی ئاو لە ناوچەکەدا، هەردوو جۆری سامانی ئاو (سەرزەویی و ژێرزەوی) هەن، ئاوی سەرزەوی بریتییە لە چەمی سەرەکی (چەمی گل) پشتی ئاشی، ئەم چەمە وەرزییە لە وەرزی بارینی باران و بەفردا ئاوی پێدا دەڕوات و لە وەرزی هاویندا دوچاری وشکبوون دەبێت. ئەم چەمە سەرەکییە لە یەکگرتنی چەندین چەمی لاوەکی پێکدێت، سەرەتا لە بەشی باشووری ڕۆژئاوا لە یەکگرتنی هەردوو چەمی حەمەئەلی و سماقە چەمی زەردەگڵ پێکدێت بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات بە باشووری گوندەکەدا تێدەپەڕێت لەگەڵ درێژبوونەوەی چەمە لاوەکییەکانی دەوروبەری تێدەڕژێ و لەهەر جێگایەک ناوێکی خۆماڵی لەخۆدەگرێ لە بەشی باشووری گوندەکە بە چەمی پشتی ئاشی ناودەبرێت لە خوار گۆڕستانی مەردەوشکە چەمی کانی قوڵقوڵەی تێدەڕژێت. پاشان بە چەمی پاراوگە ناودەبرێت، لە باکووری گۆڕستانی شێخ حەوشێ بە چەمی ناوتووان ناودەبرێ، لەوێدا چەمی سەعداوا و گەرمەوشێی تێدەڕژێت، لەکۆتاییدا چەمی گل پێکدەهێنێت و دواتر دەڕژێتە چەمی پشتە، ئەو چەمەش بە ئاڕاستەی باکووری ڕۆژهەڵات دەڕوات و دەڕژێتە چەمی گەڕاو پاشان بۆ چەمی زمکان ئەویش لەگەڵ ڕووباری سیروان تێکەڵ دەبێت پێش گەیشتنی بە دەریاچەی دەربەندیخان. نەخشەی (6).

لە سنوری شارەدێی گلێجاڵ چەندین سەرچاوەی ئاوی ژێرزەوی (کانی) بەناوبانگ هەن گرنگترینیان کانی (گەچێن)ـە

کە دەکەوێتە باکووری گوندەکە و سەرچاوەی سەرەکی ئاوی گوندەکەیە. گەچێن یەکێک لە سازگارترین سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوە و ئاودێرییە لە ناوچەکەدا، ئەم کانیاوە تایبەتە لە بناری شاخی خۆشکدایە و هۆکاری سەرەکی نیشتەجێبوون و دامەزراندنی گوندی گڵێجاڵە لەم هەوارگەی ئێستای، چونکە تاکە سەرچاوەی سەرەکی ئاوی خواردنەوەی دانیشتوانی گوندەکەیە لە کۆنەوە هەتا ئێستا. ئاوی ئەم کانیاوە جگە لە خواردنەوە بۆ ئاودێری مەرەزە و بەرهەمهێنانی برنجی کوردی و تەڕەکاڵی تر بەکارهاتووە، تا ساڵانی دوای ڕاپەڕینیش لە ساڵانی نەوەدەکان ئەم ئاوە (16) پشک بووە، هەرپشکە و هی خێزانێک بووە کە پێی دەوترا (شەوو ڕۆژێک ئاودێری)، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا بەهۆی کەمبونەوەی ئاوەکە لە ئەنجامی گۆڕانی کەشوهەوا و زیادبوونی بەکارهێنانی بۆ خواردنەوە، توانای کانیاوەکە بۆ ئاودێری مەرەزە کۆتایی هات، ئێستا تەنها بۆ خواردنەوە و هەندێک ئاودێری تەڕەکاڵ بەکاردێت، ئەمەش یەکێکە لە لێکەوتەکانی گۆڕانە سروشتییەکان کە لە ناوچەکە و جیهاندا بەردەوام لە پەرەسەندندایە.

پێشتر ئاوی گەچێن لە ڕێگای جۆگاوە دەگەیشتە گوندی گڵێجاڵ کێشە و گرفتی زۆری پیسبوون و گەرمبوونی لە ڕێگا بۆ دروست دەبوو، لە ساڵی 1963 بۆ یەکەم جار پرۆژەیەکی لەسەر دروستکرا بە تێچووی (500) دیناری عێراقی، لەژێر چاودێری بەڕێوبەری ناحیەی سیروان بە ڕێوەچوو، بۆ ئەنجامدانی کارەکانی ئەم پرۆژەیە لم و چەو لە بناری

خۆشک (هەرۆژاوەکە) دابینکراوە بۆ دروستکردنی حەوز بۆ کۆکردنەوەی ئاوەکە، بۆرییەکانیش بە سواری وڵاغ لە شاری هەڵەبجەوە گوازراونەتەوە، ئەمەش دەسپێکی گەیشتنی خزمەتگوزاری میری بووە بۆ ئەم دەڤەرەی قەزای هەڵەبجە، کە بەهۆی نەبوونی ڕێگا و دوورە دەستییەوە لە خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکانی ژیان بێبەش بووە. بەهۆی هەڵقوڵانی ئاوی گەچێن لەناو تاشەبەرد و چەوی قەدپاڵی چیا ئاوێکی سارد و سوک و سازگاری هەیە، بەلای خەڵکی ناوچەکە بەگشتی و دانیشتوانی شارەدێی گڵێجاڵیشەوە گەچێن یەکێکە لە سەرچاوە ئاوییە دەگمەنەکان و تا ئاستی پیرۆزیی و ئەفسانە هۆگریی و بەسەرهات لەبارەیەوە هەیە. بێجگە لە کانی گەچێن، لە سنوری شارەدێی گڵێجاڵ دەیان کانی و سەرچاوەی ئاوی تر هەیە، گرنگترینیان: سەوەردە، کانی هەرمێکە، کانی هەواس، چنارەکان، قوڵقوڵە، کانی قەرگ .... هتد.

یەک لە سەرچاوە ئاوییەکانی تر لەم ناوچەیە کە زیاتر بۆ ئاودێری پشتی پێبەستراوە بریتییە لە (هەسێر)، بەناوبانگترین هەسێرەکانی گڵێجاڵ (هەسێرەکەی سۆفی فتاح، هەسێرەکەی وەستا قادر، هەسێرەکەی سەوەردە، هەسێرەکەی کۆسی کانی توو، هەسێرەکەی سماقە، هەسێرەکەی کانی خۆشک، هەسێرەکەی کانی گورگیل، هەسێرەکەی چنارەکان، هەسێرەکەی تەنگەکەرێ).

**ئاووهەوا:**

سیستەمی ئاووهەوا لە ناوچەکە هاوشێوەی سیستەمی ئاووهەوای دەریای ناوەڕاستە، بەشێوەیەکی گشتی لە دوو وەرزی سەرەکی پێکهاتووە، وەرزێکی ساردی باران و بەفراوی کە وەرزی زستانە، وەرزێکی وشکی گەرم کە وەرزی هاوینە، لەگەڵ بوونی هەردوو وەرزی مام ناوەندی بەهار و پایز، خەسڵەتەکانی کەشوهەوا بەپێی ئەم وەرزانە گۆڕانیان بەسەردا دێت. بەپشتبەستن بە داتاکانی هەردوو وێستگەی هەڵەبجە و دەربەندیخان کە نزیکن لە ناوچەکە بارانبارین لە مانگی تشرینی یەکەم دەستپێدەکات و لە مانگەکانی دواتردا بەردەوام دەبێت تا مانگی مایس پاشان وەرزی بێ بارانی دەستپێدەکات کە چوار مانگ دەخایەنێت. تێکڕای ساڵانەی بڕی باران لە ناوچەکە دەگاتە (670.2) ملم، زۆرترین بڕی لە مانگی کانونی دووەم باریوە (121.2) ملم، بەشێوەیەکی گشتی زیاتر لە نیوەی بارانی ساڵەکە لە مانگەکانی زستاندا دەبارێت.

هەروەها ناوچەکە ساڵانە بەفری تێدا دەبارێت، بەڵام بەهۆی نەبوونی وێستگەی کەشوهەوا پێوانە نەکراوە، لە ڕاپۆرتێکی چاککردنەوەی ڕێگای گلێجاڵ ئاماژە بەوەکراوە کە بە تێکڕا ساڵانە بە ئەستوری (10)سم بەفر دەبارێت. [426]

---

[426] KRG, Ministry of Construction & Housing, Directorate General of Roads & Bridges Preliminary Environmental and Social Screening the **Balasu – Snur – Brwen – Kani Pasha** local road, E1311v4, March 2008, p22.

تێکڕای پلەی گەرمای ناوچەکە (20) پلەی سەدییە لە وەرزی هاوین بەرزدەبێتەوە و لە مانگی تەموز دەگاتە (32) پلە، بەڵام لە مانگەکانی زستاندا نزم دەبێتەوە و لە مانگی شوبات (7.3) پلەیە. هەرچەندە ئەمانە تێکڕای وێستگەی هەڵەبجە و دەربەندیخانە بەشێوەیەکی تەواوی گوزارشت لە کەشوهەوای ناوچەکە ناکات، بۆ نمونە پلەی گەرما لە وەرزی زستاندا نزمترە لەم پلەیە و لەو ڕاپۆرتەی ئاماژەمان پێکرد تێکڕای پلەی گەرمای زستان لەم ناوچەیە بە (6) پلە لەژێر سفرەوە دانراوە.

سەبارەت بەشێی ڕێژەی تێکڕای ساڵانەی دەگاتە (45.6%)، لە مانگەکانی زستاندا بەرزدەبێتەوە بەرزترین ڕێژەش لە مانگی کانونی دووەمدا تۆمارکراوە کە بریتییە لە (73.9%) و لە مانگەکانی هاویندا ڕێژەکە نزم دەبێتەوە، لە مانگی ئابدا دەگاتە (23%)، تێکڕای خێرای باش لە ناوچەیە دەگاتە (6) ملم/ چرکە.

---

.

**خەسڵەتەکانی ئاووهەوا لە هەردوو وێستگەی دەربەندیخان و هەڵەبجە**

| مانگەکان | بڕی باران / ملم | | | شێی ڕێژەیی | | | پلەی گەرما | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | هەڵەبجە | دەربەندیخان | تیکرا | هەڵەبجە | دەربەندیخان | تیکرا | هەڵەبجە | دەربەندیخان | تیکرا |
| کانونی دووەم | 119.9 | 122.6 | 121.2 | 71.8 | 6v | ٧٣.٩ | 7.3 | 9.6 | 8.5 |
| شوبات | 100.0 | 123.8 | 111.9 | 66.8 | 73 | 69.9 | 6.3 | 8.2 | 7.3 |
| ئازار | 126.9 | 113.2 | 120.1 | 59.3 | 66.5 | 62.9 | 9.22 | 12.2 | 10.7 |
| نیسان | 87.0 | 72.1 | 79.5 | 62.7 | 57.5 | 60.1 | 16.7 | 18.3 | 17.5 |
| مایس | 39.3 | 31.7 | 35.5 | 35 | 42.7 | 38.9 | 24.3 | 25 | 24.7 |
| حوزەیران | 0.0 | 0.4 | 0.2 | 27 | 29 | 28.0 | 30.2 | 30.3 | 30.3 |
| تموز | 0.0 | 0 | 0.0 | 28.3 | 31.2 | 29.8 | 30.3 | 34 | 32.2 |
| ئاب | 0.0 | 0 | 0.0 | 24.8 | 21.45 | 23.1 | 30.1 | 32.5 | 31.3 |
| ئەیلول | 0.0 | 0.2 | 0.1 | 25.8 | 34.1 | 30.0 | 30.3 | 29 | 29.7 |
| تشرینی یەکەم | 14.7 | 21.2 | 18.0 | 26.3 | 35.2 | 30.8 | 24.5 | 24.4 | 24.5 |
| تشرینی دووەم | 63.9 | 78.85 | 71.4 | 47.1 | 35.2 | 41.2 | 14.9 | 14.3 | 14.6 |
| کانونی یەکەم | 106.3 | 118.53 | 112.4 | 76.6 | 70.65 | 73.6 | 8.3 | 8.6 | 8.5 |
| تیکرا | 657.9 | 682.58 | 670.2 | 46.0 | ٤٦.٨ | 45.6 | 19.4 | 20.5 | 20.0 |

**سەرچاوە:**

١ـ سليمان عبدالله اسماعيل، تایبەتمەندییەکانی باران لە هەرێمی کوردستانی عیراق)، مركز الدراسات الستراتيجية، السليمانية ٢٠٠٦، لا ٤٦ ـ ٤٩.

٢ـ منظمة الاغذية والزراعة العالمية FAO، مكتب شمال العراق، وحدة المناخ الزراعي، بيانات محطتي حلبجة ودربنديخان، للفترة ١٩٩٥ ـ ٢٠٠٣.

2ـ منظمة الاغذية والزراعة العالمية FAO، مكتب شمال العراق، وحدة المناخ الزراعي، بيانات محطتي حلبجة ودربنديخان، للفترة 1995 ـ 2003.

**خاک**

سیماکانی بەرزونزمی و کرداری کەشکاریی و پۆشاکی ڕووەکی و پێکهاتەی جیۆلۆجی گرنگترین هۆکاری دروستبوون و کارکردنەکانی سەر خەسڵەتی خاکن. لە سنوری شارەدێی گڵێجاڵ بەهۆی ئاڵۆزی بارودۆخی تۆبۆگرافی بەتایبەتی لێژی، باری سەختی ئاووهەوا کە داباریینێکی زۆر بەخۆیەوە دەبینێت، چڕی تۆڕی جۆگا و

ئاوڕێژەکان خاکەکەی گەشە ناکات، چونکە ئەم هۆکارانە ڕێگا نادات بە گەشە و ئەستوربوونی خاک و زۆربەی خەسڵەتەکانی خاکیش کەموکورتی دەبێت و زۆر شوێن خاک هەر دروست نابێت.

خاکی ناوچەکە بەشێوەیەکی گشتی لە زۆربەی ناوچەکاندا قوڵییان کەمە و ڕووی چینەبەردەکان لە دەرەوەن، ڕەنگی خاکەکەی بەگشتی ڕەنگێکی کاڵە، ڕێژەی کاربۆناتی کالسیۆم تێیدا کەمە بەهۆی داشۆرینی لە ڕێگای ئاوی بارانەوە.

سەبارەت بە جۆرەکانی خاک لە ناوچەکەدا بە پشتبەستن بە پۆلێنکاری (بیورینگ) بۆ خاکی عێراق دوو جۆر خاکی سەرەکی لەو ناوچەیەدا بەدەردەکەوێت: نەخشەی (7).

**1. خاکی زەوی بەردەڵانی درزبردووی سەخت:**

زۆربەی سەر ڕووی ناوچەکە بەم جۆرە خاکە داپۆشراوە، ئەم خاکە ناسراوە بە خاکی ناوچە چیاییەکان هەربۆیە تێبینی ئەوە دەکرێت کە چیا و قەدپاڵەکانی چیای خۆشک بەرزایی و نشێویەکانی ناوچەکە بەم جۆرە خاکە داپۆشراوە و نزیکەی (85%) خاکی شارەدێی گڵێجاڵ پێکدێنێت.

مادەی سەرەکی و بنەڕەتی ئەم جۆرە خاکە پێکهاتووە لە بەردی کلس، قوڵایی کەمە بەهۆی کرداری ڕامالینی ئاوی لە ڕێگای داباریــن، بەشێوەیەکی گشتی ئەم جۆرە خاکە ناسراوە بە کەمی ماددەی ئۆرگانی ئەمەش یەک لە گرفتە سەرەکییەکانە کە دوچاری کشتوکاڵ دەبێت لەم ناوچەیە.

**2. خاکی بناری قاوەی داپۆشراوە بە پێکهاتەی بەختیاری:**

ئەم جۆرە خاکە ڕووبەرێکی بچووک دادەپۆشێت لە ناوچەکە، بەشێوەیەک ڕێژەی ڕووبەرەکەی نزیکەی (15%) کۆی ڕووبەری سنوری شارەدێی گلێجاڵە. لە زەوییە نزمەکانی بەشی ڕۆژهەڵات لە دەشتی گلێجاڵ و بەشێک لە گلێجاڵە بچکۆلە بەدیاردەکەوێت.

ئەستوری ئەم خاکە بە بەراورد بە جۆری یەکەم زیاترە ئەم جۆرە خاکە بەوە دەناسرێت کە ڕێژەی خوێ و جبسی تێدا کەمە، ئەم بەشەی ناوچەکە بۆ کشتوکاڵ بەتایبەت دانەوێڵە بەکاردێت.

**پۆشەری ڕووەکی**

سنوری شارەدێی گلێجاڵ دەوڵەمەندە بە ڕووپۆشی ڕووەکی سروشتی بەهۆی ژینگە چیاییەکەی، ئەمە سەرباری ئەوەی هەڵکەوتەی دەڤەرەکە لە بنار چیای خۆشک و ئاڕاستەی بنارەکانی ئەم شاخە بەرەو ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵات یارمەتی دەرن بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری تیشکی هەتاو بەپێچەوانەی بنارەکانی ئەودیوی چیایەکە کە ڕووە و خۆرن بە ئاڕاستەی ڕۆژئاوای، ئەمەش وایکردووە قەدپاڵی بەرزاییەکانی سنوری شارەدێی گلێجاڵ بە داری تاڕادەیەک چڕ داپۆشرێن.

ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تر بەرزی خۆی کاریگەری هەیە لەسەر گەشەی ڕووەک لەم دەڤەرە شاخاوییە، ئەمەش خۆی دەبینێتەوە لە جیاوازی جۆرەکانی ڕووەک بەتایبەتی دابەشبوونی ستوونی لەگەڵ بەرزبونەوە لە قەدپاڵەکان تا لوتکە.

بەشێوەیەکی گشتی ڕووپۆشی ڕووەکی ناوچەکە دەکرێت بە دوو بەشەوە، بەپشتبەستن بە شیکردنەوەی وێنە ئاسمانییەکان دەتوانیین بەم شێوەیە دەست نیشانیان بکەین: نەخشەی (8)

**یەکەم _ دارستان:**

لە قەدپاڵی بەرزایی و چیاکانی سنوری شارەدێی گڵێجاڵ دارستانی سروشتی بەڕوو بە فراوانی بەدی دەکرێت، ئەو ناوچانەی ئەم جۆرە دارستانەی تێدا دەڕوێت لێژییان یارمەتیدەرە بۆ ئاوڕێژبوونی ئاوەکانیان و کۆنەبوونەوەی خوێ، بەمەش خاکێکی تفت دروست دەکات و ژینگەیەکی لەبار دەڕەخسێێت بۆ ئەم جۆرە دارستانە، بەشێوەیەک نزیکەی ڕێژەی (68%) ناوچەکە بەم جۆرە ڕووپۆشە ڕووەکییە داپۆشراوە.

لەڕووی چڕییەوە ئەم جۆرە دارستانە دەکرێت بە دوو بەش، دارستانی چڕ کە لە بەشی سەرەوەی چیاییەکان بەدەردەکەوێت ڕێژەی نزیکەی (27%) کۆی ڕووبەری ناوچەکە پێکدەهێنێت، و دارستانی مام ناوەند لەڕووی چڕییەوە کە ڕێژەی نزیکەی (41%) کۆی ڕووبەرەکە پێکدەهێنێت.

سەبارەت بە جۆری دار بەڕووەکان بەپێی ئەو پۆلێنکارییەی بۆ جۆرەکانی دار بەڕوو کراوە لە عێراق، بە پشتبەستن بە بەرزی لە ئاست ڕووی دەریا، دوو جۆر دار بەڕوو لە ناوچەکە بەدیار دەکەوێت: دارستانی بەڕووی وشکی ئاسا: Quercus Aegilops ، لە دامێنی نزمی چیاییەکانی

ناوچەکە بەدیار دەکەوێت لە بەرزایی نێوان (500 – 750)م لە ئاستی ڕووی دەریا. لەگەڵ دار بەڕوو و گوێژ و هەنجیری کێویی و قەزوان دەبینرێت.

جۆری دووەم دارستانی بەڕووی دندار Quercus libani، ئەم جۆرەیان لە قەدپاڵی بەرزاییەکان دەبینرێت، چونکە لە بەرزی نێوان (750 ـ 1200)م دەڕوێت، ئەم جۆرە دارستانە لە چیای خۆشک و قەدپاڵەکانی بەدی دەکرێت، بەهۆی جیاوازی لە بوونی ڕێژەی شێ جیاوازی هەیە لە چڕیی و قەبارەی دارەکانی ئەم جۆرە دارستانە، بێجگە لە داری بەڕوو چەندین جۆری دیکە لە داری سروشتی لە ناوچەکەدا بەدیدەکرێت، لەوانە (دارەبەن (قەزوان)، سماق، تاوگ، بلاڵوک، کێکف، پەڵک، بایو (چەقالە)، تورەک). بەدرێژای چەم و ڕێڕەوە ئاوییەکانی ناوچەکە چەندین جۆر دار و دەوەنی قەراغ سەرچاوە ئاوییەکان دەبینرێت، لەوانە ژاڵە و بی و زریسگ.

**دووەم_ گژوگیا:**

لە سنوری شارەدێی گڵێجاڵ بەشە نزمایی و گردۆڵکەکانی دەڤەرەکە بە گژوگیا دادەپۆشرێت بەتایبەتی لە وەرزی بەهار، ئەم جۆرە گژوگیایە نزیکەی ڕێژەی (23%) ڕووبەری ناوچەکە دادەپۆشێت.

# بەشی حەوتەم
# کەلەپووری گڵێجاڵ

حەمید محەمەد عەبدوڵڵا



بەکالۆریۆسی هەیە لە زمان و ئەدەبی کوردی زانکۆی سەلاحەدین (هەولێر)، سەرپەرشتیاری پەروەردەییە لە قەزای شارەزوور و چەند وەرگێڕانێکی بڵاوکراوەی هەیە.

هەموو گەل و نەتەوەیەکی ڕۆژهەڵاتی فۆلکلۆر و کەلەپووری تایبەت بە خۆی هەیە و هەموو ئەندامانی ئەو میللەتە تیایدا بەشدارن، هەرچەند لەلایەن کەسێکی بە ئەزموون و هەستیارەوە دانراوە، بەڵام چووەتە قاڵبی ڕۆشنبیریی و بیرکردنەوەی گشتیی و هەموویان بە مووڵکی خۆیان زانیوە، لەم مەیدانەدا خەڵکی گڵێجاڵیش کەلەپوورێکی سادە و خاکەساری تایبەت بەخۆی هەیە و زانیاری و ئاستی بیرکردنەوە و ئەدەبیاتی هەموو دانیشتوانی گوند بووە و چێژیان لێوەرگرتووە و ئامۆژگاری یەکیان پێکردووە و پێیەوە پابەندبوون.

**یەکەم ـ ئەفسانە و ڕاز**

لە ڕابردوودا زۆر بایەخی پێدراوە و کراوەتە خۆراکی عەقڵی نەوەکان و بێ ئیشی خۆیانیان پێ پڕکردۆتەوە و باوەڕیان پێی هەبووە و بەڕاستیان زانیوە، هەربۆیە چەندین ئەفسانەی ئەندێشە ئامێزیان ڕێکخستووە و ڕازی هەزار وشەیان هۆندووەتەوە، هەست و هزری خۆیانیان پێ تێرکردووە، وەکو ئیلهامی ئایینی بڕوایان پێ هێناوە، لەم بوارەشدا چەند ڕاز و حیکایەتێکی تایبەت بە گلێجاڵ هەن ڕەنگە هەندێکیشیان هاوبەش بێت لەگەڵ دەوروبەر، بەنمونە:

**ئەفسانەی "موڵکەحمەد"**

پیاوێکی خەیاڵیی و خاوەن ئازایەتییەکی بێ سنوور(لەدیس دەرچوو)بووە، موڵکەحمەد سەرقافڵەیە و دەچێت بۆ کاروان و دەگاتە شاخەڕەش لەوێ ئەژدیهایەک دەبینێ مرۆڤ قوت دەدات ئەم بە خەنجەر لەت و کوتی دەکات، پاشان دەچێت

بۆ بیابان لەوێ دەگات بە نۆ دێو شەڕی دەستەویەخەیان لەگەڵدا دەکات و دەیانشکێنێ، دواتر دەچێتە شارێک لەوکاتەدا خەڵکی شارەکە باز هەڵدەدەن بۆ هەڵبژاردنی کەسێک ببێتە پاشای شار، ئەمیش بەشداری ئەو کۆبوونەوەیە دەکات و باز دەنیشێت بەسەریەوە و دەبێتە پاشای ئەو شارە تاج (جقە)ی شاهانە دەکەنە سەری.

**ئەفسانەی جیجیلە و بیبیلە**

ئەمەش ڕازێکی ترە، گوایە مەڕێک و بزنێکی شەل لە ڕان جێماون لە کەناری چەمێک دەلەوەڕێن پاشان دەپەڕنەوە لە ئاوەکە، بیبیلە ئاو دەیبات و جیجیلە دەچێتە ئەو بەر، دواتر بزنەکە ئاوس دەبێت و دوو کاری دەبێت و دەیانبات بۆ ناو ئاشە بەردینەیەک بۆئەوەی لە دڕندە بیانپارێزێت، دەرگایان لێ دادەخات، یەژێ: ئەگەر گورگ هات و داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد دەرگای لێ نەکەنەوە و بێژن تۆ ڕەنگت چۆنە؟ وتی ڕەنگم ڕەشە، ئێوە بڵێن دایکی ئێمە سپیە، وتی: سپیم، بڵێن دایکی ئێمە سورە و باوەڕی پێ مەکەن، چونکە گورگ فێڵزان و درۆزنە و خۆی دەکات بە دایکتان بۆئەوەی بتانخوات، هەرچۆن بوو گورگ فرسەتی هێناو کارەکانی خوارد، دایکیان (جیجیلە) بە گووانی پڕ لە شیرەوە گەڕاوە و دەبینێت بەچکەکانی خوراوە، دەچێت شیرەکەی دەدات بە ئاسنگەر بۆئەوەی دوو شاخی ئاسنینی بۆ دروست بکات، تاکو بتوانێت لەگەڵ گورک شەڕ بکات، دواتر بزنەکە دەگاتە گورگ و شەڕی لەگەڵ دەکات و سکی گورگەکە دەدڕێ و

بەچکەکانی لەسکی گورگەکە دەهێنێتە دەرەوە، بەمشێوەیە حەق سەردەکەوێت بەسەر ناحەقدا.

چەندین ئەفسانەی تر لەسەر زمانی پیاوە بەتەمەنەکانی گڵێجاڵەوە بیستراوە و ئەمەش چەند نمونەیەکی ترە (سێ برا کەچەڵەکە، تەوبەی ڕێوی، ڕۆستەمی زاڵ، فاتەی سورەوان، گورگە شەل.......هتد).

**دووەم ـ داستانی قارەمانێتی**

ئەمەش بەسەرهاتێکی دەگمەن و ناوازە و سەرسامکەرە و قارەمانێتی کەسێک لەڕووی ئازایەتی یان ئەویندارى دەردەخات، کۆمەڵێک داستان و بەسەرهاتی واقیعی و زیندوو لە گڵێجاڵ ڕوویداوە بەشانازییەوە دەیگێڕنەوە و کردوویانە بە پاڵنەری ئازایەتی دروست کردن، داستانیش لە گڵێجاڵ جۆراوجۆر بووە، نمونەی:

١ـ بەشداری کردن لە شەڕەکانی فەلەستین چەند پیاوێکی گڵێجاڵی بەشدارییان لەو شەڕانەدا کردووە و دواتر وەک داستانی قارەمانێتی بەسەرهاتەکەیان گێڕاوەتەوە وەک: ئەحمەد عەبدولڕەحان، حەمەشەریفی مامۆفەرەج، محمد ئەحمەد (حەمەغەدارە)، مەحمود ئەحمەد محەمەد.

**٢ـ داستانی ئازایەتی (مامۆ ئەولا و مەلا فەرەج):** کە چەندین قۆناغ بەدوای بەرازدا ڕایان کردووە و بێ ترس و ماندووبوون توانیویانە بیگرن و گوێچکەی ببڕن ئەوکاتەی حکومەت پاداشتی داناوە لەسەر قەلاچۆکردنی بەراز و پاداشتی خەرجکردووە بۆ رادەستکردنی گوێچکەکەی. مەلا مەحمودی مەلا فەرەجیش لەم راوەدا ناوی هەیە.

**٣ـ داستانی مەحموی ڕۆمی یان یوسفی تفەنگچی،** ئەمەش پیاوێکی زیرەک و چاونەترس بووە و توانیویەتی حەوت کەسی ڕێگری قەڵخانی ببەزێنێ و باری دزراوی خۆی بگێڕێتەوە، یان بۆ بڕینی هەنگ مێخی بە شاخی خۆشکدا داکوتیوە و لە جێگەیەکی زۆر بەرز هەنگوینەکەی داگرتووە.

٣ـ **داستانی قارەمانێتی ڕووبەڕووبوونەوەی وەسمان بەگ.** کە چەند جارێک فەتاحی پەریزاد و عەبدوڵڵای ئەحمەد بەرانبەر زوڵمی ئەو دەرەبەگە وەستاون و هەڕەشەی شکات کردنیان لێکردووە، تەنانەت ئەگەر چونەتە پەترپیۆت(پترسبۆرگ). تەنانەت مردنی فەتاحی پەریزادیان بە موژدانە بۆ هۆسمان بەگ بردوونیەتییەوە.

٥ـ **داستانی مامۆعەمینە** کە خاوەن هێز و قوەتێکی زۆر جیاواز بووە و توانیویەتی حەماڵێک بە تەنها هەڵبگرێت، کە شەش پیاو نەیانتوانیوە هەڵیبگرن، جگە لەوەش گۆڕهەڵکەنی ئاوایی بووە و کەسێکی بەتوانا بووە. یان مەحمودی کاکەسەن بە تەورێک دوو پۆلیسی چەک کردووە و دەستی بەستون بە سواری وڵاخەکانیان بردوونیەتەوە بۆ مەرکەزی پشتە و لەسەر ئەو ئازایەتییە خەڵات کراوە.

**سێیەم ـ بەسەرهات**

بەسەرهاتێکی خۆش یا ناخۆشە لە ژیانی خەڵکدا ڕوودەدات و واتایەکی جوانی هەیە و هەندێک جار بۆ پێکەنین و هەندێک جاریش بۆ پەند لێوەرگرتن لەلایەن کەسێکی لێزانەوە دەگێڕدرێتەوە و بەو کەسەش دەڵێن چیرۆکخوان، خەڵکیش

بەتاسەوە گوێی لێ دەگرن، لە گڵێجاڵ چیرۆک زۆرە، بۆ نمونە:

- **بانگەکەی ڕەزاوەیس**: مامۆ ڕەزاوەیس ئاشەوان بووە، چەند دزێک ئێوارە دێنەسەری بەمەبەستی تاڵانکردنی ئاشەکەی، ئەویش بەلێزانی خۆی کولێرەیەکیان بۆ دەبرژێنێت و دەڵێت ئێوە ئەوە بخۆن هەتا من بانگێک دەدەم دواتر هەرچیتان ویست بیبەن، دەچێتە سەر کەوەلەکە و بە دەنگی بەرز هاوار دەکات ئەڵاهو ئەکبەر ئەڵاهو ئەکبەر، ئیتر محەمەدی مستەفا وسەین بەبانگەکە دەزانێت و تێ دەگات چییە.

ئەگەر قسە ئەکەم چەنەمەشکێنن ئەر قسە ناکەم ئاشەکەم ئەبڕن. بەم هاوار و بانگدانە خەڵکی ئاوایی تێدەگەن ئاشەوان لە چ حاڵێکدایە و فریای ئەکەون و دز لە کولێرە خواردن تەواو نەبوون دەگیرێن.

- **چیرۆکی مامۆ غەفور و چەڵتوکەکە:** ساڵێک دەشتی بەلەسۆ مەرەزەی هۆسمان بەگ دەبێت و کوێخا غەفوریش سەرکاری گۆخڵەکان، دوای درەوکردن و کوتانی مەرەزەکە، کوێخا غەفور دەیەوێت هەندێک لە ڕەنجی گۆخڵەکان بە فێڵ وەربگرێتەوە پێش ئەوەی هۆسمان بەگ بگاتە سەر خەرمان، دەڵێت چوار گا بێنن و هۆڕەکان پڕکەن لە چەڵتوک و هەر هۆڕێک تاکە کڵاشێکی تێ بکەن، کەس لە گۆخڵەکان لەم ڕازە تێناگەن هەتا سبەی هۆسمان بەگ دەگاتە سەر خەرمان و هەست دەکات بەڵمی مەرەزەکە زۆرە و دانی کەم، گومان دەکات کە دزرابێت، بۆیە بانگی کوێخا غەفور دەکات سوێند

بخوات لەم خەرمانە نەبراوە، ئەویش سوێند دەخوات و دەڵێت: سوێند بەخوا شتێ بە کڵاشەوە لەم خەرمانە دەرنەچووبێت هیچی لێ نەبراوە، ئەو بەناو پێڵاوی خەرمان شەنکەرەکان تێدەگات و کوێخاش مەبەستی بارەکانە.

**مەلا مەحمود و شێخ مەحمود**

جارێک مەلا مەحمودی مەلا فەرج کە فەقێ بووە لەبناری قەرەداغ، ڕۆژێک مەلیک محمودی حەفید هاتوە بۆ ئەو ناوچەیە، بۆ نوێژی عەسر چووەتە مزگەوت، پاش نوێژ چووەتە ناو فەقێکان و یەک یەک پرسیاری لێ کردوون، کە سەرە گەشتوەتە سەر ئەم پرسیاری لێکردووە: کوڕم خەڵکی کوێیت؟ ئەویش وتویەتی، قوربان خەڵکی گڵێجاڵم لە بناری خۆشک، ئەویش وتویەتی، ئا ناوی گڵێجاڵم بیستووە، بەپێی ناوی گوندەکەتان بێت دەبێ خەڵکی ئەو گوندە هەمووی پیاوی کەڵەگەت و قیافە ڕێک وبەهەیکەل بێت، ئەمیش هەرچەندە خۆی کەڵەگەت و قایم بوو وتبوی: ئەرەوەڵا قوربان لە گولی و بچوکیا منیان ناردووە بۆ فەقێیەتی. ئیتر هەمووان دایانە قاقای پێکەنین.

**کاشیەئاوبێنن بۆ شەهاب:**

جارێک شەهاب دێت بۆ گڵێجاڵ، کەسێکی گڵێجاڵی کە دەوترێت مام عەبدوڵڵا ئەحمەدە پلانێک دادەڕێژێت بۆ هەراسانکردنی ئەم میوانە، دەڵێت، ئێستا شەهاب هات تینویەتی و گەرمایەتی من ئەڵێم بە کەسەکەی تەنیشتم جامێ ئاو بێنن بۆ شەهاب، تۆش بڵێ بە هاورێکەی ترت، ئەویش

بلّێ بە هاوڕێکەی تری، شەهاب تورە ئەبێت و بە تەڵاق سوێند ئەخوات ئاو لە گڵێجاڵ نەخوات.

**چوارەم ـ  نوکتە و گاڵتەوگەپ**

ئەو وتە و کردەوە سەرنجڕاکێشانەیە کە بینەر و بیسەر دەخەنە پێکەنین و چێژ و خۆشی پێ دەبەخشن، لەلایەن کەسی گاڵتەجار و نمایش جوانەوە پێشکەش دەکرێت، لەم بوارەدا گڵێجاڵییەکان ناویان زیاتر دەرکردووە لە ناوچەکەدا بۆ قسەخۆشی و وەڵامدانەوە لەکاتی خۆیدا، نمونەی ئەو پیاوانەی بۆ قسەخۆشی ناویان دەرکردووە، فەتاحی مستەفا و کوڕەکانی، هەروەها کەسی دیاری ئەم مەیدانەش حسێن فەتاح ـ ـە (مامۆ حسەین) کە خاوەن دەیان نوکتە و چیرۆک و بەسەرهاتە و خەڵکی تووشی سەرسامی کردووە و ناوبانگیشی بۆ دەرەوەی گڵێجاڵ ڕۆیشتووە، قسەی خۆش و نوکتەکانی تا ئێستاش بەسەر زاری خەڵکەوەیە، لەوانەش:

ـ جارێک دەرمانی مێش دەکڕێت لە دوکانێک و پارەکەی نادات، دوای ماوەیەک خاوەنی دوکانەکە داوای پارەکەی لێ دەکات، ئەویش دەڵێت: پێت نادەم، چونکە مێش لە ماڵی ئێمە کەمی نەکردووە، چەنێک مێشی کوشتووە ئەو دەرمانە ئەوەندەی تر هاتوون بۆ تەعزییەکەی و نەڕۆشتوونەتەوە.

ـ شەرعی مانگاکە، کە زڕکوڕەکەی مانگایەکی کوشتووە و شەرعی پێ کراوە، مامۆ حسەین شەرعەکەی بردووەتەوە و پارەی مانگایەکیشی لە خاوەن مانگاکە وەرگرتووە.

ـ  سواڵکەرە بێ زمانەکە، کەلێی داوە و زمانیشی پێ کردووەتەوە.
ـ یا بەزمی چۆغەو ڕانکەکە کەقاتێک بەئەمانەت دەبات  پاش ماوەیەک خاوەنی دێت بەشوێنیدا، کە پێی دەداتەوە، دوایی دەڵێ پێنج دیناری تێدا بووە.
ـ لە ساڵانی هەشتاکان، کارمەندێکی کارەبا چوبووە ماڵیان وتبوی پارەتان زۆر بۆ هاتۆتەوە ئەوە چییە هەر بۆت نابژێردرێ و بڕەکەی 30 دینارە، ئەویش چوبووە ژوور و تاکێک قاڵی هێنابوو وتبوی دەی ئەمە هەڵگرە لەجیاتی پارەکەو باقییەکەیم بدەرەوە.. ئەویش وتبوی: سوعبەتم کرد هیچت لا نییە، بابە قاڵیم چۆن بۆ هەڵئەگیرێ..
یەکێکیتر لە وانەی قسەو نوکتەی خۆشیان هەیە، محەمەد ئەحمەد عەزەمە کە ئەم بەسەرهاتانەی لێوە دەگێڕنەوە:
جارێک مامەڵەی هەندێک حەیوان دەکات پارەکەی (10) دیناری کەمە، کابراش پێی دەڵێت سوێندی خواردووە بەقەرز نەیفرۆشێت، ئەویش دەڵێت باشە، نایبەم تۆزێکیتر، بە کابرا ئەڵێت، کاکە پارەت پێیە (10) دینارم بەقەرز پێ بدەیت، ئەویش پێی دەدات و لەو پارەی لەکابرای قەرز کردووە حەیوانەکان هەر لەخۆی دەکڕێت.
ـ لەگەڵ پیاوێکدا کەوتووتە قسەو گفتوگۆ، بەکابرای گوتووە، هەرچی دەبەمەوە، خێزانەکەم دەیکاتە ئاو، کابراش پێی دەڵێت ئەگەر هی ئەوبێت تەلاقی دەدات.. ئەمیش مەبەستی چاو شەکر و سابون و تایت بووە.

**پێنجەم ـ  بەزم و گۆرانی:**

گۆرانی لە هەست و سروشتی هەموو مرۆڤێکدایە و ڕازونیازی شاراوەی ناو دەروونە و هاتنەجۆشی ناخی مرۆڤە، لەکاتی خۆشیی و ناخۆشیدا بە شێوازی لاواندنەوە و بالۆرە دەردەبڕێت، لەوکاتەی مرۆڤ گۆرانی دەچڕێ ناخی پڕدەبێت لە هەستی خۆشیی و سەرفرازی یان سۆز و شین کردن بۆ مردوویەک بە دڵێکی پڕ لە خەم و ئاە هەڵکێشان.

لەم بوارەدا گڵێجاڵییەکان گۆرانی جۆراوجۆریان هەیە و بۆ هەموو بۆنەیەک بە گۆرانییەک گوزارشتیان لەو واقیعە کردووە و چەندین کۆپلە گۆرانی بەزمەسات و مەرگەساتیان هەیە لەسەر شێوازی هۆنراوە و بەکێش و سەروای خۆماڵی دەریان بڕیوە، سەروای مەسنەویی و سەروای یەکگرتوو یان جووت سەروایان بەکارهێناوە. بە زۆری بەیتەکانیان جووت سەروایە و لەگەڵ ئەمەشدا هۆرەی جافی و مەقامی قەتار و ئای ئای و گورانی خاو و شادیان وتووە.

چەند نمونەیەک لەو گۆرانیانەی لە گڵێجاڵ وتراوە:

١ـ دووری وڵاتان بەگوێ ژنەوتم

خواکاریێ وایکرد خۆم تیایدا خەوتم

٢ـ چل خەم چل خەیاڵ چلیش وەسواسە

سێ چل چۆن دەرکەم بەیەک هەناسە

٣ـ ئەونە هاتووم بووە بەخوێنم

ماچێکم بدەرێ با دڵم بشکێنم

٤ـ ئارێ ئەگرێ وەچیاخوانۆ

ئەو ئارە من بووم شەو وەلای ڕانۆ

٥ـ هەر لەیرا لەیرا تا سەلیم پیرک
دەستم وەدامێن نەچم لە بیرت.
٦ـ خالقە و خالقە هەزارو یەکی ناوە
ئەو ئاسمانە وەبەرزی بێ چڵە و هەسون وەساوە
من وەدڵ سڵاوم کرد
وەنازۆ جوابی داوە
بەناز و دڵی شەرمین چارشێوەکەی هەڵداوە
چاڵێ لەسەر ڕومەتی پڕ لە عەتر و گوڵاوە
سەد ملّقم لێدا وەڵا
هێشتا تاسقم نەشکاوە.

**شەشەم ـ مەتەڵ:**

قسەیەکی ئاڵۆزە و بەشێوەیەکی لێکچواندن دەردەبڕێ و بە ئاسانی مانا و مەبەستی نازانرێ و بیرکردنەوەی دەوێت، هونەرێکی ڕەوانبێژی و سەلیقەی دەوێ بۆئەوەی بتوانی مەتەڵێک دروست بکەی، هەندێک لەو مەتەڵانە لە گڵێجاڵ زۆرتر باوبووە:

١ـ تاڵێ هەورێشم تا بەغدا ڕایئەکێشم/ جادە
٢ـ سێ چوارو یەک سێ، دوودانەی تەمام/ نوێژ
سێ گرێی ڕەوشەن فەرزە لەلای عام
٣ـ بەسەر سەیدە بەپێ منالە، بەتیروکەوان ڕۆستەمی زاڵە/ سوچەڕ
٤ـ وە گیای کەژی، وە مووی بزن، وە فیڵی ژن/ چیغ
٥ـ ماینەڕەشی هەشت دەری هەشت چوکڵ وەژێری سەری/ دەوار

٦- قەڵای گۆشتین، پلەی ئاسنین/ ئەسپ و زین

٧- هەر ساڵێ ساڵێ هەر دەورێ دەورێ
دوو ئاو لە جامێ هەریەک لە تەورل/ هێلکە

٨- هەر ساڵێ ساڵێ هەر جایە جایە
شیر وەبێ هەوێن لە خۆی ئەمایە/ بنێشت

٩- تەپە وردیلەی گیا خنجیلە/ سەر

١٠- تەپە ورتەڵەی وە تەپۆ تاشیاو
عێراق و ئێران هاتە تەماشاو/ دەف

١١- چواری چاوە، هەشتی هەنگاوە، بوەڕی ناوە/ گاجووت

١٢- چوارچڵەی گوێزێ دووانی ئەگری
دووانی ئەلەرزێ، ڕانی دایکی تیا ئەتەزێ/ گوانی مانگا

١٣- دایک پێچپێچین باوک قژنەسەر
لێیان ئەکەوێ شیرن وشەکەر/ دارمێو

١٤- دایک گڵ و باوک گڵ
لێیان ئەکەوێ خەمشە کوڵ/ کاڵەک

١٥- هەر دەڕوات و لا ناکاتەوە/ چەم

١٦- سەگی هار چووە سەر دار
پەلوپۆی هێنایە خوار/ تەور

١٧- بەرزە وەک چنار، سەوزە وەک خەیار، مزرە وەک هەنار/ ڕێواس

١٨- وە بەرخی سپییە، وە کاوڕی سوورە، وە مێیی ڕەشە/ تووڕک

١٩- قەڵای گەچین ڕێی نییە تێی بچین/ هێلکە

حەوتەم _ پەند و قسەی نەستەق

دێڕە وتەیەکی جوان و ڕەوان و پڕمانا و کاریگەرە، بەمەبەستی ئامۆژگاری دەوترێت لە قاڵبی کینایە و پەردەپۆشدا، پەندەکان ڕەگێکی قووڵ و مێژووییان هەیە، بەڵام لە هەر ناوچەیەک هەندێکیان باو و بڵاوە و زیاتر بەکاردەهێنرێن، ئەو پەندە کوردییانەش کە زۆر لە گلێجاڵدا بەکارهێنراون ئەمانەی خوارەوەن:

١- قەوم قیبلەیە.

٢- توڵ بە تەڕی ئەچەمێ.

٣- تەیری گول عاشقی داری ژەقنەمووتە.

٤- هەرکەس بە تەمای کاسەهاوسێی ماڵان بێ، بێ شێو سەرئەنێتەوە.

٥- بڕۆ وە بێگار، دامەنیشە وە بێ کار.

٦- دەستی شکا و هەواڵەی گەردن ئەکرێ.

٧- کردەی گایە و خوردەی یابوو.

٨- هەرکەسێ نەڕوا بۆ کاروانی.

تێناگا لە سەروبنی ژیانی.

٩- خزم گۆشتت بخوا ئێسقانت ناشکێنێ.

١٠- لە ئاوی شەو پارێزەکا.

١١- بۆ ئەوە مەگری ڕۆیشتووە، بۆئەوە بگری کلکی ناوەتە شانۆ.

١٢- هەموو شتێ چاوەڕێی وادەیە، وادە چاوەڕێی هیچ ناکا.

١٣- هەقە هەقدارم، بەشە بەشدارم.

14. مارانگاز لە بەنە بازەڵە ئەترسێ.

15_ دە بدە بە هەشت، هەشت بگرە لە مشت.

16_ زۆرم هەیە و تەوەنە هەڕم.

17_ بشکێم و نەزرێم.

18_ دە بکەمە منداڵ پێستە سەگ نەیبا، کە سەگ بردی فایدەی چیە؟

19_ هێستر خۆی دانی خۆی زیاد دەکات.

20_ قەوم هەر قەومە، خەڵک هەر خەڵکە، دار هەردارە، پەڵک هەر پەڵکە.

21_ ئەوەڵی چلە و ئاخری چلە مەدە لە ملە.

22_ لە ئاگر خۆڵەکەوە بەجێ دەمێنێت.

هەشتەم ـ گوزارشت و دەربڕینەکان:

١ـ خوا دەلیلی داماوە، واتە هاوکاری بێ کەس و دەسە.

٢ـ گشتی دەبێتە ماڵ سکەڕۆ نابێتە ماڵ، واتە چڵێس و فرەخۆر نابێتە خاوەنی ماڵ.

٣ـ لە بانی چاکی نوێژ بکە، واتە داوێن پاکە.

٤ـ بەرد ئەکا وە ئاو، واتە زۆر چەوساوە و بەشخوراوە.

٥ـ نەوە کاوڕی تێر شیرم خوارد، نەوە مەڕی تێر گیام خوارد. واتە خێرم لە خۆم نەدیوە.

٦ـ ماڵی بووە وە سەروەشی ماڵان، واتە پرش و بڵاوە.

٧ـ بووە بە گیای بنی کوانوو، واتە فەوتاوە.

8_ لە ئاگر خۆڵەکەوە جێدەمێنێت، واتە وەک باوکی نییە و ئۆجاخی کوێرە.

9_ عیسا گرتوویە موسا ئاخنیویەتی، واتە زۆر قەڵەوە.

10_ هەرکەسێ بیکوژێ دەستی سەوز دەبێ، واتە دەبێتە سەیدی تەواو.
11_ ئاگر لە بانی پشتی بکەرەوە، واتە زۆر هەژارە.
12_ کەر لە بەرماڵی بکەوێ دانی دەشکێ، واتە ڕەزیل و نانکوێرە.
13_ هەتا نەیانخستە تەوەق نەیوت ئامەنت و سەدەق، واتە لاسار و ئینکارە.
14_ تۆ مەنی من دوو مەنم جگە لە گورز و کەمەنم. واتە لە تۆ ئازاتر و بە دەسەڵات ترم.
15_ شەش دانگی هاوە دوای فلان کەسەوە، واتە لەو باشترە.
16_ برا حەز لە مەرگی برا ناکا بەس حەز بە لاتی دەکا، واتە حەسودن بەیەکتر.
17_ من دەیکەم بە بەرەک ئەو دەبێتە پاڵو، واتە خۆی دەیدۆڕێنێ.
18_ هەزار جەردە هەژارێکی پێ ڕووت ناکرێتەوە، واتە هیچی نیە بیبەن.

**نۆیەم _ داب و نەریت**

**١- پێتەکی**

بریتییە لەو خەڵات و دیارییەی کە لەلایەن ماڵی باوک و دایکەوە دەبەخشرا بەو کچەیان کە دەدرا بەشوو، ڕێزیان لێدەنا و بەدەستی خاڵی بەڕێیان نەدەکرد بۆ ماڵی مێردەکەی و لە ماڵی خۆیان بەشێکیان پێدەدا، بەشەکەش بریتی بوو لە:

پارچەیەک زەوی یان چەند سەر ئاژەڵێک یان گایەک یان هەرشتێکی تر بە پێی توانا.

**٢- سوورانە**

ئەمەش ئەو دیاریی و سەوقاتیانە دەگرێتەوە کە کاتێک کوڕ ژنی دەهێنا یان کچ شووی دەکرد خزمانی هەردوولا و دەرودراوسێ بەدەستی پڕەوە دەچوونە سەردانیان و پیرۆزباییان لێ دەکردن، دیارییەکانیش زۆرتر پارە یان خواردەمەنی یان کەرەستەی ناو ماڵ بوو، وتەیەکی باوی پیرۆزباییش هەبوو دەوترا: پیروخەڕۆ بن.

**٣- نۆماڵی**

سەرەتا بوک و زاوا ماوەیەکی زۆر لە ماڵی خەزور دەژیان و بوک لەژێر ڕکێفی خەسودا بوو، تا ماڵ و خانوویان دەکرد و جیادەبوونەوە و ماڵێکی نوێیان پێکدەهێنا، ئیتر لە هەموو لاوە کەسوکار دەچوون بۆ هاوکاریی و دەستباریان، نۆماڵیان بۆ پێکدەهێنان کە بریتی بوون لە: بەڕە، تیانچە، نوێن و لێف، قوت، کاسە و کەوچک، گڵێم .....هتد.

**- حەوتم یان(گوێزەوان)**

کاتێ خانەوادەکان مناڵیان دەبوو لە ڕۆژی حەوتەم ئاژەڵێکی چاخیان بۆ پێشوازیی و شوکرانەبژێری سەردەبڕی و بۆ هاتنە دونیای ئەو مندالە گۆشتیان لێدەنا و ئاهەنگیان بۆ دەگێڕا، پاشان ژنانی خزم و دراوسێ دەچوون بۆ موبارەکبایی و ڕاساڵکاریی و دیارییان بۆ دەبرد، بە زۆریش بریتی بوو لە: پارە یان لانک و دەسرازە، موروو یان پەڕۆوپالە.

**٥- نۆهەوار.**

هەر خێزانێک خانوویەکی تازەی بکردایە یان باری بکردایەتە خانوویەکی تر شەوان خزمان و هاوسێیان دەچوونە هەوارگە نوێکەیان بۆ موبارەکی، بەدەستی پڕەوە دیاریی و سەوقاتیان بۆ دەبردن و شەونشینیان لەگەڵ دەکردن بە زۆری: پێخەف و نوێن و قاپ و قاچاغی ناوماڵ یان کەمالیاتیان بۆ دەبردن.

**٦- باربوو**

ئەمەش لەکاتی لێقەومان و زیانلێکەوتندا هەموو خەڵکی دۆست و دەوروبەر دەست دەکەن بەیەکدا و هەرکەس لای خۆیەوە یارمەتی و پیتاک دێنێت و قەرەبووی کەسی لێقەوماو دەکەنەوە و باری سوک دەکەن و لەو نەهامەتییە ڕزگاری دەکەن بەبێ پاداشت و بەرامبەر، لەم بوارەشدا زۆرکەس لە گلێجاڵ ناوبانگ و چیرۆکیان هەیە لەوانەش محەمەد مستەفا وسەین کە کوێخا بووە، هەروەها عەبدوڵڵای مەلا یوسف کە بەسەرهاتی بەخشندەیی و خێرخوازیی زۆرە و لە سەرەمەرگدا دەفتەی قەرزەکانی خۆی سووتاندووە.

**٧- هەیاران و مەیاران**

لەکاتی وشکەساڵی و بێبارانیدا هەموو منداڵانی ئاوایی بوکێکیان لە پەڕۆ دروست دەکرد و دەیانکرد بە دارێکی بەرزدا و هەڵیاندەگرت و بەناو ئاواییدا دەگەڕان بە دەنگی بەرز هاواریان دەکرد و دەیانگووت:

بووکە بە بارانێ ئاوی بن دەغڵانێ

هەیاران و مەیاران یاخوا داکاتە باران

بۆ گەنم و جۆکەی جاران          بۆ فەقیر و هەژاران

ئەو کۆمەڵە منداڵە بیاندایە بەلای هەر ماڵێکدا، ماڵەکە جامێک ئاویان دەکرد بەسەریاندا لەگەڵ هەندی نوقڵ و شیرینی.

**٨- بەپیرەوەچوون**

ئەگەر کەسێک لە شوێنێکی دوور بگەڕایەتەوە وەک سەفەری حەج یان سەربازی یان کاروانی دوور و ونبوون ئەوا خەڵکی ئاوایی بە کۆمەڵ دەچوونە بە پیرییەوە بە چەپڵەڕێزان و ئاهەنگێڕان و دەیانهێنایەوە و زۆرجاریش قەسیدە دەخوێنرایەوە بەتایبەتی مەولایاسەلی، پاشان خواردن و چێشت دروست دەکرا.

**٩- بەڕێکردن و ئەسپاردن**

کاتێک پیاوێکی ئایینی و زانایەکی مسوڵمان یان میر و ئاغای ناوچەکە بمردایە بە قەسیدە و بەیت و بالۆرەی غەمگین و شیعری ئایینی دەیانبرد بۆ گۆڕستان و ئەسپەردەیان دەکرد، شیوەن و گریانی بەکوڵیان بۆ دەکرد و بەناو هۆزدا کۆتەڵیان بۆ دەگێڕا(کۆتەڵ واتە جلوبەرگی مردووەکەیان دەکرد بە دارێکدا وەک داهۆڵ و ئالا هەڵیان دەکرد و دەکەوتنە شوێنی بە گریان و شیوەن و ڕۆڕۆ).

**١٠- عازێتی گرتن**

ئەمەش عادەتێکی زۆر باو بوو کە هەر ماڵێک کەسێکی گەنجیان بمردایە دەیانگووت (جوانەمەرگ) بووە، واتە بە گەنجی و جوانی مردووە، بۆیە ژنانی نزیکی وەک دایک، خوشک، کچ، خزمی نزیک عازێتیان بۆ دەگرت و تەرکی خۆشیی و جوانکاری و گەڕانیان دەکرد و پۆشاکی ڕەشیان

دەپۆشی و لە ماڵەوە خۆیان بەند دەکرد، پیاوانیش ڕیشیان دەهێشتەوە و پیشیان دەخواردەوە و دەستیان دەکرد بە ئاخ هەڵکێشان و تووتن کێشان، زەماوەند و شایی و لۆغان قەدەغە دەکرا هەتا وەختانوەخت، تەنانەت ئافرەتی مێرددار قاری لەخۆی دەگرت و لە مێردەکەی جیا دەبوویەوە.

**١١ـ گەرمیان و کوێستان**

بەپێی گۆڕینی کەشوهەوای ناچەکە باریان دەکرد، لە وەرزی گەرمادا دەچوونە کوێستانەکان و کەپریان دەکرد و بە جێگەکەیان دەگووت کەپرەهەوارگە کە خانووەکانیش چۆڵ دەبوو پێیان دەوت قشلاخ، چونکە هۆکارەکانی فێنکەرەوە و ئاوساردکردن نەبوو، لەوەرزی سەرماشدا دەگەڕانەوە گوندەکان و خانووەکانیان، زۆرجاریش بە هۆکاری لەوەڕ پەیداکردن کۆچیان دەکرد.

**١٢ـ کاسەهاوسێ**

هاوماڵەکان کاسە و دەوریان پڕکردووە لە چێشت و بردوویانە بۆ ماڵە دراوسێکەیان و بەپێچەوانەشەوە، هەر خواردنێکیان هەبووایە بەیەکەوە دەیانخوارد، ئەوەندە گیانی هاوکاریی و هاوسۆزی لە نێوانیان زاڵبووە پێیان خۆشبووە لە خواردنی خۆشی یەکتر بەشدار بن.

**١٣ـ ڕاتبەی فەقێ**

واتە بەش و جیرەی ئەو فەقێیانە دەدرا کە بۆ خوێندن ڕوویان لە شار و گوندەکانی کوردستان دەکرد، گلێجاڵێش بەوپێیەی لە دوای ساڵانی ١٩٤٥ەوە مزگەوتی تێدا دروستکراوە هەمیشە کۆمەڵێک فەقێ لە مزگەوت هەبوون،

لەو خواردنانەش خاوەن ماڵ دەیخوارد بەشی فەقێ دەدرا وەک هێلکە، بەرەمەشکە(کەرێ)،نان، ڕۆن، ساوەر، دۆینە......هتد، بەو ئومێدەی لە خێری ئەو زانستەی فەقێ وەریدەگرێت بەشداربێت، چونکە خۆیان بە بەشدار زانیوە لە پێگەیاندنی فەقێدا.

**١٤- سەوقاتی**

بریتییە لە بردنی دیاریی و خەڵات بۆ ماڵی دۆست و ئاشنا، کاتێک ماڵێک تازە دێتە شوێنێک یا خانووی نوێ دروست دەکەن یان کاتی خوازبێنی بۆ زیادکردنی ڕێز و خۆشەویستی و دڵخۆشکردنی ماڵە خەزوران.

**١٥- بێگاری**

ئەو کۆمەڵە ئیش و کارەیە کە بە نابەدڵ و بێ پاداشت و بە سوخرەکێشی و بەڕووگیری یان زۆر بۆ ماڵی ئاغا، دەرەبەگ، شێخ یان بارەگای حیزب دەکرێت، بە دڵێکی ناخۆش و بۆڵەبۆڵ تەواو دەبێت.

**١٦- شەریکی شێخ**

ئەمەش هاوبەشییەکی دوولایەنەی ئارەزوومەندانەیە کە دەروێش و موریدەکان بڕیاریان دەدا کە ئەو بەرهەمەی هاتە گۆزەی من لە بەرخ و لە کار بیکەمە دووبەش لەگەڵ شێخ، یان هەرچی بەرهەمم هەبوو لەو خەرمانە سەری حاسڵات بەشی شێخی تێدابێ.

**١٧- کاروانی**

کۆمەڵە پیاوێکی زیرەک و وریا پێکەوە دەچوونە کاروانی و قافڵەیان دەبەست، چوون و هاتنەوەیان پێکەوە بووە،

بۆئەوەی ئاگاداری یەکتربن و هامڕاو هاوخەمی یەک بن لەو گەشتەدا، باری کاروانییەکانیش خەڵوز و دار و هێش و بەرهەمی گوندیان بردووە بۆ شار، لەوێش زیاتر بە کەلوپەلی پێویست و خواردەمەنی گۆڕدراوەتەوە و کەمتر بە پارە فرۆشراوە، یان بە کۆمەڵ چوون بۆ باراشکردن.

**١٨ـ هەقداری**

هەر ئافرەتێکی گەنج مێردەکەی بمردایە دەبوو نزیکترین کەسی پیاوەکەی ژنەکە بخوازێ و لە دەستیان دەرنەچێ، ئەگینا دەکەوتنە بەر تانەی خەڵک هەرچەند ژنەکەش ناڕازی بووایە ناچار بووە بەو بارودۆخە ڕازی بێت و دەیان وت "هەقە هەقدارم و بەشە بەشدارم".

**١٩ـ لێدان**

زەمانی پیاو سالاری زۆر پیاوێک حەزی لە لێدانی ژنەکەی کردووە بە حەق و بە ناحەق، هەر لەکاتی کچێنیدا لەماڵی باوکیدا بە زۆر دەدرا بەشوو بەو کەسەی دڵخوازی باوک و دایکی بووە و پرسیشیان پێ نەکردووە، لەگەڵ گەیشتنی بە ماڵی زاواش، زاوا لەسەر جێگەیەکی بەرز دەوەستا پرژێکی دەدا لە سەری بووک بەو مەبەستەی بووک لێی بترسێ، دواتریش هەموو کارێکی قورسیان پێ دەکرد، لێدان لە ژن بەشێک بووە لە کەلتووری گوند و بەشێک بووە لە غیرەت و جوامێری، بۆیە مێرد لە ژنی خۆی داوە، هەندێک جار خەسوو و هێوەریش لە بووکیان داوە.

**٢٠- خێڵایەتی**

ئەندامانی گوند وەها پەروەردە دەکران پارێزگاری لە خێڵی خۆیان بکەن و دەمارگیربن بۆی، هەمیشە بە تەنگ کەم و کورتی خێڵی خۆیانەوە بن و بەشێوەیەک ڕاهێنرابوون خراپییەکانی نەبینن، لەو ڕوانگەشەوە وتویانە قەوم قیبلەیە، لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا پشتی یەکیان بەرنەداوە و خۆیان لەپێناو خێڵ و خزمی شەڕ و مەرافەیان کردووە.

**٢١- تەخمین**

واتە مەزەندەکردن، لە سەردەمی پاشایەتی و کاتی شۆڕشیشدا باچاوەش یا کادیری حیزب دەهاتن بۆ خەملاندنی کشتوکاڵ و تەڕەکاڵ و باخ و حەیوان، بەمەبەستی دیاریکردنی بەشی ئاغا یان حیزبەکەی خۆی بەشێوەی زۆرداریی و چاوسوورکردنەوە .

**٢٢- بەشەئاو**

بنەماڵەکانی گوند هەستاون بە دابەشکردنی سەرچاوەکانی ئاوی ئاوایی، بەشێوەیەک کەم کەسێک هەبووە لە دێ بەشە ئاوی نەبێت بەمەبەستی سودمەند بوون لە ئاوی ئاوایی بۆ بەکارهێنانی لەکاری کشتوکاڵی تەرەکاڵدا، لە گڵێجاڵیش ئەم دابەشکارییە هەبووە بۆ نمونە کانی ئاوی گەچێن بەسەر چوار بنەماڵەدا دابەشکراوە، بنەماڵەکانیش (هەسەن، ڕەحیم، خەلیفە، حەمەوەیس)، ئەو بنەماڵەنەش لەو کانییە بەشیان نەبووە لە سەرچاوەی ئاوی دیکە سوودیان وەرگرتووە و خاوەندارییان کردووە.

**٢٣- نانەسکی**
واتە ئیش کردن (درەو، شوانی، مزوری مالآن .....هتد) بەنان و خواردنی ڕۆژانە بەمەبەستی بەردەوام بوون لە ژیان و خۆنەچەماندن لە ئاست ئەو نەبوونی و قات وقڕییەی بەسەر وڵاتدا هاتووە.
**٢٤- وەرزێری**
واتە دروێنەکردنی گەنم و جۆ و مەرەزەی ماڵی دەوڵەمەند بە داس لە بەرانبەر دیاریکردنی پاداشتێک بۆی، پارە یان بەرهەمی ئەو بەروبوومەی دروێنەی دەکات.
**٢٥- ماڵەوا**
ئەو کەسانەی دەبوون بە شوان یا گاوان لە بەرانبەر کرێی ئەو کارەدا ئێواران ئەو ماڵانە دەگەڕان کە شوانی یان گاوانیان بۆ دەکردن بۆ نان، دوو یا سێ نان لە بەرانبەر چەند سەر مەڕ و بزن یان مانگا لە ماڵان کۆدەکردەوە و ژیانی خۆیی و ماڵ و منداڵی پێ بەڕێ دەکرد.
**26- پرسە:**
لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی مەرگی ئازیزێکدا قورپێوان و بانگ و سەڵا دەستی پێ دەکرد، بە دەنگی بەرز هاواریان دەکرد و هەموو خزمان و هاوگوندان دەهاتن بۆ بەشداری و چەند پێیاوێک دیاری دەکران بۆ شۆردن و کفن کردنی مردووەکە، پاشان لە گۆڕستان دەنێژراو دەگەڕانەوە بۆ ماڵ و پرسە دادەنرا، حەوت شەو و حەوت ڕۆژ لە پرسەدا دەمانەوە و دەستیان لە کار و فەرمانی خۆیان هەڵدەگرت و پێشوازیان لە میوان دەکرد، لە هەر گوندێکەوە چەند کەسێک بە نوێنەرایەتی خەڵکی دێکەیان هاتوون و بەناوی کۆی گوندەوە

سەرەخۆشیان لە خاوەن مردوو کردووە، پاش پرسە کۆتەڵ گێڕان دەستی پێ دەکرد و بەسەر جلوبەرگی مردووەکەدا شیوەنیان دەکرد و خزمان ئاگادار دەکران ڕیش بتاشن و کەسی یەکەمیش تا وەختانوەخت عازێتیان دەکێشا و ژنهێنان و بەشوودان و خەنەگرتنە قژ قەدەغە بوو، هەموو هۆکارێکی خۆشی و ئەسبابی هونەری یاساغ دەکرا.

**27- هاوسەرگیریی و زەماوەند**

کچ بەشوودان زۆر سەخت بووە لەو ڕۆژگارەدا، لەبەر کەمی ژمارەی کچ و نەریتی خێڵ، دواکەوتوویی و کلتووری کۆمەلایەتی یەکێکی تربوون لەو کۆسپانەی لە بەردەم پرۆسەکەدا، بۆیە کچ ناچار بووە لە سنورێکی بەرتەسکی کۆمەلایەتیدا شوو بکات و کوڕانیش ناچاربوون چەندین ساڵ بێگاری ماڵی خاوەن کچ بکەن تا خاوەن کچ دڵی نەرم دەبوو ڕازی بێت بیکات بە زاوای خۆی، پاشان هێجوو (خوازبێنی) دەکراو پاش مشتومڕێکی زۆر لەسەر مارەیی بووک دیاری دەکرا و پاشان بە سواری ماین یا ئەسپ ژن گواستنەوە دەستی پێ دەکرد.

شێوازی گواستنەوە وابووە کە کەسێک جڵەوی ماینەکە بگرێت و ژنان و کچان بە چەپڵەڕێزان یاوەری بووک بکەن و کومەڵێک سوارچاک لە گۆڕەپانێکی ئاوایی غارغارێن بکەن، کە بووک دەگەیشتە ماڵی زاوا، زاوا لە سەربانێک ڕادەوەستاو بووکیان دەهێنایە بەردەمی ئەویش بە پرژێک دەیدا بەسەریدا بەو مەبەستەی بووک لە زاوا بترسێ و دواتر بووک دەبووە کچی ماڵەخەوور و لای خەسوو ئیشی پێ

دەکرد تا دەبووە خاوەن ماڵ و منداڵی خۆیی بەسەربەخۆیی دەژیا.

**28- مەولوودنامە**

لە مانگی مەولوودی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) ماڵە بەدین و ناندارەکان ئاهەنگیان دەگێڕاو ئەو یادەیان بە زیندوویی ڕادەگرت و کۆمەڵێک لە مەلاو خوێندەوار و پیاوە دیار و بەتەمەنەکانی گوندیان بانگهێشت دەکرد، چێشت و خواردنێکی زۆر لێ دەنراو بخوردیان دادەگیرساند و شیرینیان دەهێنا و قەسیدەیان بەسەردا دەخوێند و دواتر وەکو تەبەڕووک دابەش دەکرا.

سەرهەڵقەی مەجلیس کتێبی ژیاننامەی پێغەمبەری دەخوێندنەوە و وچانێکی دەدا و کەسێکی دی شیعرێکی لە وەسفی پێغەمبەردا دەخوێندەوە و ئامادەبووانیش بەشێوەی کۆرس دەیان گووتەوە بەدوایدا، نمونەی شیعرەکان:

مولاي صل وسلم دائما أبدا

يا آمنة بشراک سبحان من اعطاک

چەندین کۆپلە شیعری دی.

**29- نەخۆشین**

هەرکات کەسێک نەخۆش بکەوتایە ڕەوشی تەندرووستی و پزیشکی لەسەر چارەسەر و دەرمان ئەوەندە کەم بووە پەنایان بردووەتە بەر شتی دەروونی و نەریتی پێشینان و باوەڕیان بە هەندێک شتی خورافیات هەبووە، وەک لەرزوتا بڕین لای کەسی پاک و بەدین، یا لەکاتی هاتنە دونیانی منداڵ ئاوی پێڵاوی کەسێکی لەخواترسیان دەدا بە

ژن بۆ سووک بوونی ژانی منداڵبوون، لەکاتێکدا کەسێک ئازاری سکی هەبووایە دەیانوت برکی کردووە و کەڵەشێرێکیان لەسەر سکی سەردەبڕی و دەیانکردە ئاڵەتەوا بۆی، یا بۆ پشت ئێشە و قاچ ئێشە شوێنی ئازارەکەیان دەگرتە پێستەی حەیوان بۆئەوەی گەرم دابێت. یان لەکاتی ونبوون یا نەهاتنەوەی مەڕومالاتیان سورەتی "والشمس وضحاها" لای مەلایەک دەخوێند بە چەقۆیەکدا و دەمەکەیان دادەخست یا کەسەکە زۆر دیندار بووە گوتوویە قوتە نەیخۆی، لەکاتی ونبووی ماڵێک چونەتە لای حسێبگەر و سۆراغیان کردووە و ئەویش ناونیشانی بۆ کردوون هەرچەند زۆرجاریش ڕاست دەرنەچووە.

**30- گەلکاری و هەرەوەزی**

یەکێکی تر لەو وێنە جوانانەی گوند بەدەمەوەچوونی یەکتر و دەستباری یەکترکردن بووە بەتایبەت بۆ ئەو ماڵانەی بەخێورکەیان نەبووە یا تەنیاباڵ بووە لە کاری درەو، گۆل هەڵدانەوە، خۆڵەبان، قوڕەبان، گێرەکردن، کاکێشان، شوێندۆزی حەیوان و وڵاخی ونبوو، بۆیە هەمووان بە دڵگەرمییەوە بەدەم یەکەوە چوون و ئەو وتەیان کردووەتە دروشمی سەرزاریان

ئەمڕۆ لە منە سبەی لە تۆیە/ گەنم تەواو بوو جا نۆرەی جۆیە

بۆ هەر جۆرە کارێکێش گۆرانییەکیان گوتووە بۆ زیاتر دڵخۆشی خۆیان و زوو بەڕێوەچوونی کارەکان.

**31- شەڕ و مەرافە**

لە گڵێجاڵ کەمترین دڵئێشان و شەڕ دروست بووە، گەر ناکۆکییەکیش ڕوویدابێت هەر زوو چارە کراوە، زۆر یەک هەڵوێست بوون بەرانبەر دوژمن بۆ پاراستنی گوند و لەوەڕگاکانیان و ڕازی نەبوون کەسی غەوارە سنووریان داگیر بکات و دەستدرێژی بکاتە سەر سنووریان.

تەباییان زۆر بوە ئەوەی خاوەن ماڵ بوە بەپێی توانا هاوکاری کەسانی کەم دەرامەت و هەژاری کردوە، دیاردەی کاسەهاوسێ لەنێوانیان زور بەرچاوبوە، ئاگایان لە حاڵی یەکتر بوە،هەموان لەیەک ئاستدا بوون. لە بوارەشدا گێڕانەوە زۆرە وەک شەڕی چەتەی هەمەوەند و شەڕی بەرەنگاربوونەوەی چەتەی قەڵخانی و شەڕی بەرەنگاربوونەوەی مام برایمی رەمەزان.

**32_ میواندۆستی**

خەڵک میوانداریکردنی غەریب و بەهاناوەچوونی کەسی لێقەوماویان بەبەشێک لە ئەرکی خۆان زانیوە، لەم میانەیەشدا دەگێڕنەوە ساڵێکیان بەگزادەکانی باوەجانی لەناو خۆیان بووەتە کێشەیان، یەکێک لەوان بەناوی سەید محەمەد سەید یەعقوب شیرەخان لەگەڵ کوڕەکانیدا ئاوارە، دەبێت و مام حسێنی فەتاح و عەلی فەتاحی برای کە ئەوکات کوێخابووە لەسەر نامەی سەید جەمیلی تاوگۆزی ئەچین بەدەمیانەوە و

ئەیانهێنن بۆ گلێجاڵ، چەندین ساڵ لەوێ میوانداری کراون، لەو ماوەیەشدا گوشاری زۆر کراوە بۆ راستکردنەوەیان بەڵام بێ ئاکام بووە.
سەرجەم ئەم داب و نەریتانەش مەرج نییە سەرجەمیان لە گلێجاڵدا باو بووبن، بەڵکە بەشێکن لە کلتورێکی گشتی گوندنشینی کە لەزۆر شوێنیتری کوردستاندا باو و بڵاون.

**دەیەم ـ یارییە باوەکانی ئاوایی لەکۆندا**

1_ ئاشە تەنورێ 2_ قوول قوولان _3 هە لووکان 4_سنجووقان 5_ هەچان 6_ گورزی بنی مێخ 7_ خاڵخاڵان 8_ خە جەڕۆ (قەرا قەرا) 9_ سینە سێ باز _10 کڵاو فڕ کێنە 11_جان جان 12_ گورز و خەتان 13_ خووگ خووگانێ 14_فسلی فسان 15_ تاقمان لە جووت 16 کڵاوێن، 17_ بەردە گەرمکێ 18_کێل و بەرد 19_ سێپاو سێلنگ 20_ خووکێش کە 21_ تەڵە و ڕێوی 21_ شان شانێن 22_ هە لور مە لور 23_ حەوت بەردێن 24_ چاڵ چاڵێن.

## کۆتایی و دەرەنجام

**سەرنجدان لە شەش بەشی ئەم کتێبە دەمانگەیەنێتە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:**

- گڵێجاڵ گوندێکە لە شێوەی شارەدێ باوەڕیش وەهایە بنیاتنانەوەی بەم پێکهاتە و ناوەی ئێستای بگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمی ڕابردوو.

- شارەدێی گڵێجاڵ سەنتەری ناحیەی بەمۆیە، کە یەکێک لە ناحیەکانی قەزای ناوەندە لە پارێزگای هەڵەبجە، دەکەوێتە بەشی باشووری خۆرهەڵاتی هەرێمی کوردستان و باشووری پارێزگای هەڵەبجە، هەروەها ناحیەی بەمۆ لەم گوندانە پێکدێت (گڵێجاڵ، بەلەسۆ، گمە، قەڵپ، پشتە، بەڕوێن، چوارداران، کانی وەیسکێ، کانی پاشا، تۆوشکێ).

- شارەدێی گڵێجاڵ لە باکورەوە هاوسنورە لەگەڵ گوندی قەڵپ، و لە باکوری ڕۆژهەڵات لەگەڵ گوندی گمە. لە ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژهەڵاتیدا گوندی پشتە هەڵکەوتوە. لە بەشی باشور و باشوری ڕۆژئاوا هاوسنورە لەگەڵ گوندی بەلەسۆ، لە بەشی ڕۆژئاوا هاوسنوورە لەگەڵ ناحیەی مەیدانی قەزای خانەقین.

- بەرمەبنای ئەو کەرەستانەی لە ناوچە شوێنەوارییەکانی گڵیجاڵ دۆزراونەتەوە، ژیان لە زەوییەکانی گوندەکە بۆ چەند هەزار ساڵێک بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە، بە دیاریکراویش هەزارەی یەکەمی پێش زایین، پێش لەم وادەیەش بەڵگەی حاشاهەڵنەگر لەبەردەستدان کە ژیان لەم گوندەدا هەبووە.

- ڕەنگە بەهۆی گۆڕانی کەشوهەوا لە هەندێک سەردەم ژیان ئەستەم بووبێت و مرۆڤەکانی ئەم ناوچەیە کۆچیان کردبێت بۆ ناوچەی تر، پاشان لە سەردەمانی دواتردا ژیان تێیدا دەستی پێکردبێتەوە.

- لەڕووی بیناکارییەوە (تەکتۆنی) ناوچەی گڵێجاڵ دەکەوێتە زۆنی نوشتاوە بەرزەکان (High folded Zone)، ناوچەکە بە ستوونێکی چینە بەردی ئەستور داپۆشراوە - لەڕووی بەرزونزمیشەوە ناحیەی بەمۆ دەکەوێتە ناوچەی شاخاوی پێچ سادەکان (چیا نزمەکان).

- سیستەمی ئاووهەوا لە ناوچەکە هاوشێوەی سیستەمی ئاوهەوای دەریای ناوڕاستە، تێکڕای ساڵانەی بڕی باران لە ناوچەکە دەگاتە ( 670.2 ملم)، بەتێکڕا ساڵانە بەئەستوری (10 سم) بەفر دەبارێت و تێکڕای پلەی گەرمای ناوچەکە (20) پلەی سەدییە.

- لەبارەی ڕیزبەندیی و کاتی کۆبوونەوەی هۆز و بنەماڵەکانی گوندەکە لەم فۆرمە نوێیەی ئێستایدا، بۆچوون و لێکدانەوە و حیکایەتی جۆراوجۆر هەن، بەڵام رەنگە خاوەندارێتی زەوییەکانی دەوروبەری ئاوایی و هەبوونی پشک لە کانیاوی (گەچێن) پێوەرێکی دروست بێت کە سەرچاوەی سەرەکی ئاوی خواردنەوە و ئاودێریی گوندەکە بووە و تا ڕادەی ئەفسانە و پیرۆزکردن حیکایەتی لەبارەوە هەیە.

- سنووری شارەدێی گڵێجاڵ دەوڵەمەندە بە ڕوپۆشی ڕووەکی سروشتی بە هۆی ژینگە چیاییەکەی بەتایبەت

لەبەهاردا، لە قەدپاڵی بەرزایی و چیاکانی سنوورەکە دارستانی سروشتی بەڕوو بەفراوانی بەدی دەکرێت.

- گڵێجاڵ لە کۆمەڵێک خێڵ و بنەماڵەی جیاجیا پێکدێت کە پەیوەندییەکی تێکچڕژاوی ژن و ژنخوازی بەیەکتریانەوە دەبەستێتەوە، ڕیشەی هاوبەشی زۆربەشیان؛ ناوچەی سەلاس و دەوروبەری شاری جوانڕۆیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

- ناسنامەی گڵێجاڵ سەرەتا بە گوند دەستیپێکردووە، دواتر زۆرێک لەو ڕەگەزانەی تێدا کۆبووەتەوە کە لە هەندێک پێناسە و شیکاردا هەن بۆ چەمکی عەشیرەت لە چەشنی: زەوی، مێژوو، پەیوەندیی و تەبایی کۆمەڵایەتی قووڵ، تەوتەم و خەمی هاوبەش و خزمایەتی ژن و ژنخوازی، لە ئێستاشدا ئینتیما بۆ گڵێجاڵ شوناسێکی ناسراوە و لە ئاستی گوند زیاترە و دەوروبەری (750) ماڵە.

- بەپێی ئامارە فەرمییەکان و بەپێی ڕووبەرەکەی کە زیاتر لە (10) هەزار و (770) دۆنمە، گڵێجاڵ گەورەترین گوندی پشتکێوی بەمۆ بووە، هەروەها یەکێکیش بووە لە گەورە گوند و نشینگەکانی سنوری قەزای هەڵەبجە بەر لە ڕاگواستنی (1978ز)،

- بەشی هەرە زۆری پێوەرە جوگرافییەکانی کۆبوونەوەی خەڵک و درووستبوونی گوند لە کوردستان لە چەشنی بەرزونزمی خاک و هەڵکەوتە، کەشوهەوا، سەرچاوەی ئاو لەگەڵ فاکتەری مێژوویی لە گڵێجاڵدا هەن، زۆرێک لەو

تایبەتمەندیانەشی تێدایە کە لە گوندە قەرەباڵغ و گەورەکانی ناوچەکە و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەن.

- گڵێجاڵ چەقی پشتکێوی بەمۆیە، لەهەمانکاتدا بەشێکە لەو ڕووبەرە جوگرافیی و کلتوورەی پێی دەوترێت (ئەوبەری سیروان)، دەوروبەریشی تێکەڵەیەکی فرەچەشنە لە هۆزەکانی جاف لە هەردووی بەری باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە، نزیکیشە لە یارسانەکانی داڵەهۆ، زۆرترین پەیوەندی و تێکەڵی و خزمایەتی گڵێجاڵیش لەگەڵ هەردوو عەشیرەتی تاوگۆزیی و باوایی - دایە پاشان قوبادی و باوەجانی.

- لە گڵێجاڵ هیچ کات ئاغایەتی نەبووە، نوێنەرایەتی شێخایەتی لە گوندەکە سێ مانگی خایاندووە، بەڕێوەبردنی گوندەکە کوێخایەتی و موختاری بووە، کوێخاکانیش پردی پەیوەندی خەڵک و میری بوون، هەرجارە و لە بنەماڵەیەکیش دەست نیشان کروان.

- گڵێجاڵ لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی و دواتریش حکومەتی عێراقدا هەتا درووستبوونی ناحیەی سیروان (1960ز) لەڕووی ئیدارییەوە سەر بە ناوەندی قەزای هەڵەبجە بووە، پاشان خراوەتە سەر ئەم ناحیە نوێیە، لە (1978ز) لەگەڵ دەوروبەرەکەی لکێنراوە بە دەربەندیخانەوە، هەر لەوساڵەشدا ڕاگوێزراوە بۆ ئۆردوگای زۆرەملێی زەڕایەن کە ئێستا شارۆچکەیەکی هاوچەرخە.

- لە کۆتایی نەوەدەکان (1999 ز) بە کردنەوەی ناحیەی بەمۆ لە گوندی گڵێجاڵ، ئاوابیەکە بازێکی گەورەی داوە

لەڕووی ئاوەدانیی و دیمۆگرافی و لەمە بەدوا ناوی شاخی بەمۆ کە دیاردەیەکی سروشتیی زەقی ناوچەکەیە بووەتە ناو و ناونیشان بۆ شارەدێ نوێیەکە.
- ڕەوشی کۆمەڵایەتی گڵێجاڵ درێژکراوە و بەشێکە لە ژیانی گوندنشینی لە بناری بەمۆ و زۆر ناوچەی تری کوردستان کە مەحکوم بووە بە ژیانی کشتوکاڵی و کلتووری خێڵەکییانەی لادێ.
- نەقشبەندییەکانی هەورامان مورید و هەواداری زۆریان هەبووە لە ئاوایی گڵێجاڵ، تەریقەتی قادریی لە گوندەکە نوێنەرایەتی هەبووە، لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردووشدا ڕۆڵ و کاریگەریی مەلاکان لە ئاواییەکەدا بە زەقی دەرکەوتووە، کە تێکەڵەیەک بوون لە خەڵکانی کاریگەر بە تەوژمی سۆفیگەریی و ئیسلامی حوجرەیی خۆجێی و کۆمەڵایەتی.
- مەلاکانی گڵێجاڵ لە حوجرەکانی هەڵەبجە و قەرەداغ و سلێمانی و دەوروبەری دەربەندیخان پێگەیشتوون، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا حوجرە لە گڵێجاڵ هەبووە، لە دوای ناوەڕاستی چلەکانیشەوە حوجرە و مزگەوت لە ئاواییەکە کراونەتەوە کە بووەتە سەرچاوەیەکی سەرەکی دابینکردنی خوێندەوار و مەلا لە دەڤەرەکە، لە هەندێک گوندی تری دەوروبەر و ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشەوە فەقێ ڕوویان تێکردووە.
- مەلاکانی گڵێجاڵ ڕۆڵی قازیی و دادوەر و پیاوماقووڵیان بینیوە لەپاڵ ئەرکە ئاینییەکانی خۆیان، هەندێکیشیان بوونەتە

چالاکی کۆمەڵایەتیی و چاوساغ و هەندێکیش کادیری سیاسي، ناوو ناوبانگیشیان سنوری ئاواییەکەی تێپەڕاندووە.
- شایی و شیوەن و پرسە و مەراسیمە کۆمەڵایەتییەکانی گڵێجاڵ هاوشێوە و چوون یەکن لەگەڵ کلتووری لادێ نشینی کوردستان لەگەڵ هەندێ تام و بۆن و ڕەنگی تایبەت بە ئاواییەکە بەتایبەت لە شایی و جەژن و بۆنە ئاینییەکانی تری وەک مەولودنامە.
- باری بژێویی و گوزەرانی ئاواییەکە لە سەردەمی پاشایەتیدا سەخت و دژوار بووە بەهۆی سادەیی کەرەستە و ئامرازەکانی ژیان، هەروەها بەهۆی نەبوونی خزمەتگوزاری میریی و کوێرەوەریی و نەبوونی خزمەتگوزاری تەندروستی و دووره دەستی ناوچەکەوە.
- خەڵکی گڵێجاڵ وەک گوندنشینەکانی تری کوردستان خۆیان گونجاندووە لەگەڵ بارگرانییەکانی سروشت و دەوروبەر و هەندێک کەسی دەستڕەنگین لە ژنان و پیاوان، کەرەستە و پێداویستی سادەی خەڵکیان بە ئیشی دەست دابین کردووە.
- چارەسەرە تەندروستییەکان لە گڵێجاڵ بەر لە (1978 ز) تێکەڵەیەک بوون لە پزیشکی گیایی و میللی و ئاینی و هەندێکجار تێکەڵ بە ئەفسانەش بوون.
- لە دوای ساڵانی (1940ز) ململانێ لەسەر تەملیکی زەوییەکانی گڵێجاڵ لە نێوان شێخانی بیارە و وەسمان بەگی شەرەفبەیانیدا چووەتە قۆناغێکی یاسایی یەکلاکەرەوە، لە ڕەتکردنەوەی ئەم پەلکێشانەی هەردوولاشدا خەڵکی

ئاواییەکە باجی زۆریانداوە هەر کۆمەڵێک و بە ڕێگایەکی تایبەت.

- بەهۆی رەتکردنەوەی مامەڵەکردنی زاهیدی کوڕی شێخ عەلائەدینی بیارە وەک خاوەن موڵک لە گڵێجاڵ و لەو کێشمەکێشەی لەسەر تەملیکی زەوییەکانی ئاوایی هەبووە، مەلا یوسفی گڵێجاڵ بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی تەملیک و باج و خەراج، هەروەها لەسەر بۆچوونی جیاواز و رەخنەو ناڕەزایەتییەکانی لە شێخ، بەدەستی یەکێک لە خزمەتکارەکانی ماڵی شێخ لە هاوینی (1946) کوژراوە.

- کوشتنی مەلا یوسف و دواتر سووتاندنی کەپری شێخ لەلایەن خزمانییەوە وەک پەرچەکردار، بووەتە دەسپێک بۆ کۆمەڵێک کارەسات و ڕووداوی تری ناخۆشی دژوار لە ئاواییەکە کە ئاوارەبوون و تاڵانکاریی و مەرگەساتی بەدوادا هاتووە.

- لە نیوەی سەدەی رابردوودا پەرەسەندنی دیمۆگرافیای ئاوایی گڵێجاڵ بووەتە هۆی لەدایکبوونی گوندێکی تر لە سنوری زەوییەکانیدا بەناوی سەعداوا (1956 ز)، کە سەرباری هەندێک تایبەتمەندیی تایبەت بەخۆی بەشێکە لە کلتوور و درێژکراوەی گوندی گڵێجاڵ و تەواوکەری یەکترن و لەسەر کەرتی (46) ی سنوری هەڵەبجەن.

- لە هەڵایسانی شۆڕشی ئەیلولدا (1961 ز) پشتکێوی بەمۆ بووەتە ناوچەیەکی ئازادکراو، بەم هۆیەشەوە ناوچەکە و گڵێجاڵ کەوتووەتە بەر ڕق و قینی ڕژێمی عێراق و

ڕووبەڕووی ئاوارەبوون و تۆپباران و دەربەدەری بووەتەوە و هەندێکیان نەفی کراون بۆ ناوەڕاست و باشووری عێراق.
- ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵکی گلێجاڵ وەک پێشمەرگە و کادر و هەڵسوڕاو و خۆبەخش بەشدارییان کردووە لە شۆڕشدا چ لە بناری بەمۆ و چ لە دەرەوەی سنوورەکە، هەروەها ئاوێتەی پەرتەوازەییە سیاسییەکانیش بوون، هەندێکیشیان بەرپرسیارێتیان وەرگرتووە، هەندێکیشیان لە شەڕەکاندا بریندار بوون و گیانیان بەخشیوە.
- ئامارەکانی حکومەتی عێراقی (1957- 1977 ز) نیشانی دەدەن کە سەرباری گەورەییەکەی لە ئاست گوندەکانیتر ی ناوچەکە زۆربەی گوندەکانی هەڵەبجە، گەشەسەندنی دانیشتوان لەم گوندەدا خاو بووە، بەهۆی شەپۆلێکی بەهێزی کۆچکردنەوە بۆ دەرەوەی گوندەکە.
- لە ئاماری ( 1957ز) کە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی ئامارەکانی دواترە، ڕێژەی نێرینە لە گلێجاڵ زیاتر بووە لە مێینە؛ (214 نێر بەرامبەر 191 مێ)، ئەمەش بووەتە هۆی گرانیی دۆزینەوەی هاوسەر بۆ گەنجەکانی ئەوکاتە.

- شارەکانی هەڵەبجە، دەربەندیخان، ناوچەی گەرمیان و سلێمانی، ڕووگەی سەرەکیی ئەو شەپۆلە کۆچ و ڕەوەبوون کە لە کۆتایی سییەکانەوە لە گلێجاڵ دەستي پێکردووە لە دوای شەستەکانەوە گەیشتووەتە ترۆپک لەپێناو دابینکردنی ژیانێکی باشتر لە کشتوکاڵ کردن و ئاژەڵداری.

ـ گڵێجاڵ وەک تەواوی گوندە سنوورییەکانی کوردستان کەوتە بەر شاڵاوی ڕاگواستن، دانیشتوانەکەی لە ئابی (1978 ز) راگوێزران بۆ شارەزوور (زەڕایەن).
ـ لە ساڵی (1991 ز) جارێکی دیکە ئاواییەکە ئاوەدانکراوەتەوە و بەشێک لە دانیشتوانەکەی بۆ گەڕاوەتەوە و وردە وردە پەرەی سەندووە بۆ ناحیە و شارەدێ.
ـ لە دوای ساڵی (1992) بەشێک لە فەرمانگەکانی گڵێجاڵ بەستراونەتەوە بە قەزای خانەقینەوە، لە ساڵی (2015) دوای هەوڵێکی زۆری دانیشتوانی ناحیەکە و ئەنجوومەنەکانی سنوورەکە جارێکی دیکە گەڕێنراوەتەوە بۆ سەر هەڵەبجە.
ـ گڵێجاڵ وەک ناحیە گەڕاوەتەوە سەر هەڵەبجە نەک گوند، هەڵەبجەش پارێزگا بووە نەک قەزا، بەمەش بووەتە چوارەمین و بچووکترین ناحیەی سەر بە پارێزگای هەڵەبجە.
ـ خەڵکی گڵێجاڵ کەلەپوورێکی سادە و خاکەساری تایبەت بەخۆیان هەیە کە زانیاری و ئاستی بیرکردنەوە و ئەدەبیاتی هەموو دانیشتوانی گوند بووە و چێژیان لێوەرگرتووە و ئامۆژگاریی یەکتریان پێکردووە و پێیەوە پابەندبوون.
ـ لە کەلەپووری گلێجاڵدا داستان و ئەفسانە و ڕاز و قسەی نەستەق هەن، کاریگەریی تایبەتی خۆشیان بەسەر پەند و ئیدیۆمە کوردییە باوەکاندا کردووە لە ڕێگای زەقکردنەوەی بەکارهێنانی هەندێکیان یان گۆڕینی دەربڕینەکانییەوە بە شێوەزاری ناوچەیی خۆیان. گوندەکەش خاوەن چەندین پیاوی قسە خۆشی ناودارە لە چەشنی مام حسێنی فەتاح.

# لیستی سەرچاوەکان

**کوردییەکان:**


ـ ئاراس محەمەد ساڵح، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لەکۆمەڵە دیدارێکی رۆژنامەنووسیدا، سەنتەری زەهاوی، 2015 .

ـ ئەمین قادر مینە: ئەمنی ستراتیجی بەعس و سێکوچکەی بەعسییان(تەرحیل، تەعریب، تەبعیس)، چاپی دووەم، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، بێ شوێنی چاپ، 1999.

ـ برایم جەلال: چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، چاپخانەی ڕوون، 2011.

ـ خەلیل ئیسماعیل و ئەیوب خەلیل جوگرافیای دێ نشینی.. کوردستانی عێراق وەک نمونە، هەولێر، 2012 .

ـ سیسیل جۆن ئیدمۆندیز: کورد تورک عەرەب، وەرگێڕانی: حامید گەوهەری، دەزگای ئاراس، 2004.

ـ شۆڕش حاجی: ئەنفالی کورد و دەوڵەتی عێراق، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، 2002 .

ـ شهمیرزادی صادق ملک، بناغەی دێرینەناسی، وەرگێڕانی: وریا قانع، هەولێر، ٢٠١٧.

ـ عەبدوڵڵا غەفور: گوندەکانی کوردستان ـ گوندەکانی باشووری کوردستان لە سەرژمێری دانیشتوانی عێراقدا(1957)، بەرگی دووەم، چاپی دووەم، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، 2005.

ـ عومەر هەمزە ساڵح: ڕاگواستن لێکۆڵینەوەیەکی جوگرافی و مێژوویی ڕاگواستنی زۆرە ملێی گوندنشینەکانی

کوردستان (پشدەر بە نمونە)، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی (دهۆک)، 2009.
ـ کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ، جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، چاپی یەکەم، کتێبی سەنتەری برایەتی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان، هەولێر، 1998
ـ مارتین فان برونەسن، ئاغاو شێخ و دەوڵەت، وەرگێڕانی: کوردۆ عەلی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، 1999.
ـ مارتین ڤان برونەسن، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، وەرگێڕانی، کوردۆ عەلی، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، 2010 .
ـ مراد حەکیم محەمەد: ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی ڕاگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، 2004.
ـ موستەفا ئیبراهیم زەڵمی، کاروانی ژیانم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، چاپی سێیەم، 2018.
ـ میدڵ ئیست وۆچ: جینۆساید لە عێراقدا، پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، وەرگێڕانی: محەمەد حەمەساڵح، چاپخانەی تیشک، سلێمانی، 2004.
ـ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ڕۆژگاری ژیان، چاپ و انتشاراتی کوردستان، 2015 >
ـ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1970.

ـ نەوشیروان عەزیز محمد. شوێنەوارەکانی شارەزوور، چاپی یەکەم، سلێمانی 2016 .
ـ هاوڕی یاسین محەمەدئەمین، لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای هەرێمی کوردستان، چاپی سێیەم، چاپخانەی کاردۆ، سلێمانی، 2014.

**عەرەبییەکان:**

ـ جعفر خياط، القرية العراقية، دراسة في أحوالها و إصلاحها، المجمع العلمي العراقي، 1950 .
ـ الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهازى المركزى للاحصاء، هيئة التعداد العام والدراسات السكانية، نتائج ترقيم المبانى والحصر السكان لسنة 1977 لمحافظة السليمانية.
ـ الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية التسجيل الاحوال المدنية العامة مديرية الشعبه الفنية، دليل التعداد العام للسنة 1965، مطبعة شركة دار الجمهورية ـ بغداد .
ـ الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، مجموعة الاحصائية لتسجيل عام 1957، لوائى السليمانية وكركوك، مطبعة العنى ـ بغداد.
ـ الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرية تسجيل الاحوال المدنية العامة ـ ديرية الشعبة الفنية، دليل التعداد العام للسنة 1965، مطبهة شركة دار الجمهورية ـ بغداد.
ـ الجمهورية العراقيه، الحهاز المركزى للاحصاء، نتائج ترقيم المباني وحصر السكان لسنة 1977 لمحافظه السليمانية، تشرين الاول 1977 .

- الجمهورية العراقيه، وزارة الداخلية(مديرية الداخلية العامة)، الموسوعة الاحصائية عن التقسيمات الادارية في الجمهورية العراقية، والمشاريع المنجزه خلال ثلاث سنوات في العهد الثورة المباركة، مطبعة الادارة المحلية - بغداد، 1962.

- الصادق بابا عزيز. مسح الأثرى وتوضيح المفاهيم(المسح الآثرى فى الوطن العربى). تونس. 1993.

- الجمهورية العراقية، وزارة الزراعة والرى، دائرة التخطيط والمتابعة، فهرس تثبيت حقوق الاراضى، مركز قضاء دربنديخان، المنشور فى الوقائع العراقية، (3740) فى 11/11/1979.

- الجمهورية العراقية، مديرية المساحة العامة، خريطة الكادسترو، الطبعة الثانية، لواء السليمانية، قضاء حلبجة، ناحية مركز حلبجة، قرية گليّجالّ، المقياس 1:10000، سنة 1963.

- المواقع الاثريه فى العراق. متحف العراقى، بغداد. 1970.

- حسن حميد محمد، البيت العراقي في العصر العثمانى عناصره المعمارية والزخرفية. رسالة ماجستير غير المنشورة. بغداد. 1982.

- خليل اسماعيل محمد، السكان والمسألة السكانية فى كردستان العراق، جامعه صلاح الدين، أربيل، 2010.

- خورشيد باشا: رحلة الحدود بين الدولة العثمانية و ايران، ترجمة:مصطفى زهران، الطبعة الاولى، قاهرة، المركز القومى للترجمة، 2008.

- ديرک كينان، الكرد وكردستان، ترجمه صلاح عرفان، كوردولوجى، السليمانية، 2010 .

ـ رغد جمال محمد غريب الجبوري. عصور ماقبل التاريخ في بلاد الرافيدين. ط.1. بغداد. 2017.
ـ شاكر خصباك، الأكراد، مطبعة شفيق، بغداد، 1972 .
ـ صلاح سعدالله، المسألة الكردية فى العراق، الطبعة الثانية، دار المتنبى للطباعة والنشرة، 2003.
ـ عباس العزاوي، موسوعة عشائر العراق، الدار العربية للموسوعات، بيروت _ بغداد.
ـ عبدالله غفور، التشكيلات الادارية في جنوبي كوردستان(1921ـ2007)، الطبعة الثانية، اربيل، 2008.
ـ عصمت شريف وانلي، كردستان العراقية، هوية وطنية، دراسة في ثورة 1961، ترجمه سعاد محمد خضر، مؤسسة ذين، السليمانية .
ـ فاروق صنع الله العمرى، على صادق، جيولوجية شمال العراق، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، 1977.
ـ فرج بصمه جى بحث في الفخار صناعته وانواعه في العراق القديم. سومر. مجلد4.عدد 1. 1948.
ـ مرسوم جمهورى(68)، رقم(52)، 6 ـ 1 ـ 1978.
ـ وزارة الداخلية (1962): الموسوعة الإحصائية عن التقسيمات الإدارية، في الجمهورية العراقية، مطبعة الإدارة المحلية، بغداد.

**فارسييەكان :**

ـ بیرو، آلن ، فرهنگ علوم اجتماعی (انگلیسی ـ فرانسه ـ فارسی) ترجمه: باقر ساروخانی، چاپ چهارم، تهران ، کیهان، 1380 .

**نەخشە و ئەتڵەس:**

ـ خريطة كادسترو (10 ـ 4 ـ 1954)، مركز قضاء حلبجة، مقاطعة 46.

ـ هاشم ياسين حداد، سەردار محمد عبدالرحمن، ئەتڵەسی هەرێمی کوردستانی عێراق ـ عێراق و جیهان، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆتامات، هەولێر، 2011،

Cambridge university press 2013, map4 Ancient and modern frontiers of suleymanieh ؛ map to illustrate major rawlison route from zuhab to xuzistan in 1836.

**نامەی زانستی:**

1ـ ديار على محمد المنمى، دراسة كيميائية وبيئية للمياه الجوفية فى مدينة السليمانية وضواحيها، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، 2002.

2ـ على محمود السورداشى، دراسة صخارية وسحنية وبيئية لتكوين سنجار فى مقاطع المختارة من منطقة السليمانية شمال شرق العراق، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين ـ اربيل، 1988.

3. مؤيد حسن جمعةدراسة رسوبية لتكوين الكولوش في مناطق مختارة من شمال شرق العراقرسالة ماجستر، جامعة بغداد، 1992.

**بڕیار و فەرمانە فەرمییەکان:**

- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران (1999/11/4)، بڕیاری ژمارە 280 بە ئیمزای کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی (ئیدارەی سلێمانی) .

- بڕیاری دادگای تەمیزی عێراقی، 58 ـ 1285، لە 1959/4/15.

- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران(ئیدارەی سلێمانی)، بڕیاری ژمارە (280)، 1999/11/4.

- کۆماری عێراق، هەرێمی کوردستان (سەرۆک)، فەرمانی هەرێمی، ژمارە(19)، 2014/3/16.

- کۆماری عێراق، هەرێمی کوردستان، سەرۆک، فەرمانی هەرێمی ژمارە (825)، 1/9 /2015 .

- هەرێمی کوردستانی عێراق، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، سکرتاریەتی ئەنجومەن، ژمارە(1694)، 13/ 2014/3.

- هەرێمی کوردستانی عێراق، ئەنجومەنی وەزیران، وەزارەتی ناوخۆ، ئیدارەی گەرمیان، فەرمانی کارگێڕی، ژمارە (11 ـ 1 ـ 2433)، 10/20 /2015.

**نامە و دەستخەتەکان:**

- دەستخەتی مەلاکانی گڵێجاڵ؛ مەلا یوسف و مەلا سەعید و مەلا مەحمود لە ناوەندی کوردستان بۆ دۆکیۆمێنت و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی، زانکۆی سلێمانی.

- مەلا عومەر عەبدولعەزیز الحسيني، بۆ برایانی عەشیرەتی گڵێجاڵ، 2003/10/20 "نامەی دەستخەت"، وێنەی لە ناوەندی کوردستان، زانکۆی سلێمانی هەیە.

**ماڵپەڕە ئەلکیترۆنییەکان:**

- المدى (2013/10/11): إحصاء 1957، https: .. almadapaper.net . view.php?cat=93971

- پۆرتاڵی ڕووداو (2020/5/13)، ژیاننامەی مەلا مەحموود گڵێجاڵی، https: . . www.facebook.com . watch . ?v=543052049688287 بەردەستە: 29/ 6 /2020.

- جامعة بيرزيت، الأنطولوجيا العربية، عشيرة، https: . . ontology.birzeit.edu ، . (22 . 6 . 2020).

- ڤەژین بوکس، https: . . lex.vejinbooks.com . ck . def . henbaneborine (25 . 7 . 2020)

- ماڵپەڕی بروسک نێت، ناساندنی پارێزگای کرماشان، http: . . www.brwska.net . articles . item . 672 (22 . 3 . 2012)

1- www.openstreetmap.org

2- U.S. Geological Survey (USGS) Earth Resources Observation and Science (EROS), Digital Elevation Data, 3V045E34N1SRTM , 2014, https://earthexplorer.usgs.gov.

3- earthexplorer.usgs.gov.

**گۆڤار:**

- سەنتەری لێکۆڵنەوەی ستراتیژی، ژ(20) ساڵی دووەم، تەموزی1993.
- ستاندەر ژمارە 25، حوزەیرانی 2008 .
- ستاندەر، ژمارە 37، 14/ 7 /2009.

**ڕۆژنامە:**

- السليمانية، پاشكۆی ڕۆژنامەی "الحوداث" لە ساڵی 1968، ناوەندی كوردستان، زانكۆی سلێمانی.
- الوقائع العراقية، العدد 3557، 3 شباط 1955، ملحق، لواء السليمانية، قضاء حلبجة، رقم المقاطعة 46 (كليجان).

**چاوپێكەوتنەكان:**

- ئەحمەد سۆفی كەریم، هەڵەبجە، 2020/6/12.
- ئەحمەد عەلی عەبدوڵڵا، گڵێجاڵ، 2020/8/30.
- ئەكرەم عەلی فەتاح، زەڕایەن، 2020/8/25.
- ئەمنە شێخ عارف، زەڕایەن، 2020/6/9.
- ئیدریس محەمەد ئەمین، گڵێجاڵ، 6/ 8/ 2020.
- باوا یاسین فەتاح، گڵێجاڵ، 2020/7/2.
- باوا ساڵح ئەحمەد نادر، زەڕایەن، 6/5 /2020.
- تۆفیق كەریم، هەڵەبجە، 7/25/ 2020.
- حاجی مەحمود عەلی محەمەد، زەڕایەن، 2020/6/5 .
- حاجی محەمەد یوسف حەمە، دەربەندیخان، 5/29 /2020.
- حاجی عەبدولڕەحیم عەزیز، زەڕایەن، 6/23 /2020 .
- حەمەتۆفیق دەروێش ئەبوبەكر، هەڵەبجە، 2020/6/29.

ـ حەمەعەلی سۆفی محەمەد، زەڕایەن، 2020/7/4.
ـ حەمەی مەلا کەریم، سلێمانی 2006/12/9.
ـ حەسەن عەلی، گڵێجاڵ، 2020/7/8.
ـ خاسێ حەسەن دۆعاگۆ، زەڕایەن، 2020/6/9 .
ـ پرۆفیسۆر خاتوو سیمۆنە موهی. 2020/7/23.
ـ زەریفێ قادر، زەڕایەن، 2020/6/11.
ـ زینەت ئەحمەد یوسف، هەڵەبجەی تازە، 24 /7/ 2008.
ـ سلێمان فەرەج عەزیز، گڵێجاڵ، 2020/7/19.
ـ شێخ محەمەد عەبدولڕحمان، گڵێجاڵ، 2020/7/5 .
ـ عاصمە مستەفا نادر، هەڵەبجە، 2020/7/25 .
ـ عەبدولڕەحمان فەتحوڵڵا یوسف، زەڕایەن، 2020/5/25.
ـ عەبدولڕەحمان حەمەساڵح، زەڕایەن، 3 /7 /2020 .
ـ عەزیز بەلەسۆیی، زەڕایەن، 2020/6/10.
ـ عەباس عەبدولقادر، هەولێر، 7/10 /2020.
ـ عەزیز مەحمود محەمەد، 6/4 /2015.
ـ عەزیز حەمەنەرمە، گڵێجاڵ، 2020/7/2
ـ عەزیز ئەحمەد عەزیز، زەڕایەن 3 /7 /2020 .
ـ فاتم مەلا فەتاح، زەڕایەن، 5/25 /2020.
ـ فەتاح محەمەد (زێبا)، گلێجاڵ، 12 /7 /2020.
ـ مەلا محەمەد مەلا سەعید، زەڕایەن،6/10 /2020 .
ـ مەلا عەلی کۆکۆیی، هەڵەبجە، 2020/6/19.
ـ مەلا عەبدوڵڵا یوسف، زەڕایەن، 17 /7 /2008 .
ـ مەلا جەلالی مەلا ساڵح، سلێمانی، 5/ 2020/6

ـ مەلا عەبدوڵڵا حەمە حەمەوەیس (حەمە جەمین)، دەربەندیخان، 2020/5/29.
ـ مەلا حەمەئەمین سەراوی، هەڵەبجە، 2020/6/27.
ـ مەلا عەزیز عەلی فەتاح، هەڵەبجەی تازە، 27 /8/ 2020.
ـ مەحمود مستەفا نادر، زەڕایەن، 2020/6/5.
ـ محەمەد حەمەساڵح سۆفی محەمەد، دەربەندیخان، 2020/8/25.
ـ محەمەد ئەمین ئەحمەد، گڵێجاڵ، 2020/8/26.
ـ محەمەد قادر یوسف، زەڕایەن، 27 ـ 6 /2020.
ـ محەمەد قادر عەزیز (خاسێ)، زەڕایەن، 6/10 /2020 .
ـ محەمەد حەمەساڵح، گڵێجاڵ، 2020/7/10.
ـ محەمەد سبحان قادر، زەڕایەن، 22 ـ 7 /2008.
ـ محەمەدی مەلا فەرەج، زەڕایەن، 23 /7/ 2008.
ـ محەمەد ئەمین مەحمود، زەڕایەن، 2020/7/5 .
ـ مریەم فەتحوڵڵا یوسف، زەڕایەن، 7 /6 /2020 .
ـ نەجمەدین حاجی مەلا، هەڵەبجە، 2020/8/24.
ـ نەوزاد لەتیف(شوێنەوارناس)، بەڕێوبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان، 2020/8/7.

**فەرمانگەکان:**

ـ ئامارەکانی ساڵی (2015 و 2016) لە فەرمانگەی ئاماری هەڵەبجە وەرگیراوە.

ـ ئاماری ساڵی (2019)ی ناحیەی بەمۆ، لە بەڕێوەبەری ناحیەی بەمۆ وەرگیراوە.

## سەرچاوە بیانییەکان:


Youkhana.R.Y.and Sissakan, V.K. Stratigraphy of (
Iraq.-Soc-Quwsanjaq area Geol-Shaqlawa

،_1Akira Tsuneki at el. Excavation at Qalat Siad Ahmadan
Iraqi – Kurdistan: First Interim Report (2014 Season). ،Slemani
RĀFIDĀN Vol. XXXVI 2015.AL

_2Konstantinos Kopanias and John MacGinnis.The Archaeology ofthe Kurdistan Region of Iraq and Adjacent Regions.Oxford. 2016.

_3Matthews Roger. The Early Prehistory of Mesopotamia
000 – 45000 bc. Subarto V. Brepols. 2000. ،500

Abigdon: ،Field Archaeology: An Introduction ،_4Peter Drewett
- books.google.iq - - . https:2001 ،Routledge
books?id=vnpGJL_HpWgC&pg=PA13&source=gbs_selected_
pages&cad=3#v=onepage&q&f=false

_5Takahiro Odaka. Excavations at ShakarTepe
2019.Unpublished Report.

Tow ،Simone Mühl ،Kamal Rashed ،Salah Sleman ، _6Saber A.
salvage excavation in Southern Kurdistan Sulaymaniyah
،Iraq(Tell Tanjaro season 2008) and (Tell Greza season 2003)
،Gesellschaft zu Berli.Mitteilungen der Deutschen Orient
Germany 2014.

New ،An Introduction to Museum Archaeology، _7Swain Hedley
.2007 ،York

،Archaeology an Introduction ،Greene kevin and Tom Moore8
.2010 ،Routledge ،USA ،fifth edition

Buringh, Soil and Soil Conditions in Iraq, Exploratory Soil Map of Iraq, Map1,Baghdad, 1957

FAO Coordination office for Northern Iraq. Hydrology of Northern Iraq Erbil, 2003 Vo.1

KRG, Ministry of Construction & Housing, Directorate General of Roads & Bridges

نەخشەی (1) هەڵکەوتەی جوگرافی ناحیـــەی بـــەمۆ





سەرچاوە:

1ـ هاشم یاسین حداد، سەربار محمد عبدالرحمن، ئەتڵەسی هەرێمی کوردستانی عێراق ـ عێراق و جیهان، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆتامات، هەولێر، 2011، لا19.

2ـ www.openstreetmap.org.



**نەخشەی (2) سنوری شارەدێی گڵێجاڵ لەناو ناحیەی بەمۆ**

سەرچاوە: الجمهورية العراقية، وزارة الزراعة والرى، دائرة التخطيط والمتابعة، فهرس تثبيت حقوق الاراضى، مركز قضاء دربنديخان، المنشور فى الوقائع العراقية، (3740) فى 1979/11/11.



نەخشەی (3) سنوری زەویەکانی شارەدێی گڵێجاڵ




سەرچاوە:

1- الجمهورية العراقية، مديرية المساحة العامة، خريطة الكادسترو، الطبعة الثانية، لواء السليمانية، قضاء حلبجة، ناحية مركز حلبجة، قرية گڵێجاڵ، المقياس 1:10000، سنة 1963.

نەخشەی (4) پێکهاتەی جیۆلۆجی شارەدێی گڵێجاڵ




FAO Coordination office for Northern Iraq. Hydrology of Northern Iraq Erbil, 2003 Vo. (1), Annex (51).

نەخشەی (5) بەرزونــزمی شــاردێی گڵێجــاڵ




U.S. Geological Survey (USGS) Earth Resources Observation and Science (EROS), Digital Elevation Data, SRTM1N34E045V3, 2014, https://earthexplorer.usgs.gov. سەرچاوە: بە پشتبەستن بە/

نەخشەی (6) دەرامەتی ئاوی شارەدێی گڵێجاڵ




U.S. Geological Survey (USGS) Earth Resources Observation and Science (EROS), Digital Elevation Data, SRTM1N34E045V3, 2014, https://earthexplorer.usgs.gov. سەرچاوە: بە پشتبەستن بە/

نەخشەی (7) جۆرەکانی خاک لە شارەدێی گڵێجاڵ




P.Buringh, Soil and Soil Conditions in Iraq, Exploratory Soil Map of Iraq, Map1,Baghdad, 1957.



سەرچاوە: بە پشتبەستن بە/

نەخشەی (8) جۆرەکانی ڕووپۆشی ڕوەکی سروشتی لە شارەدێی گڵێجاڵ




سەرچاوە: بە پشتبەستن بە/ وێنەی ئاسمانی8 landsat:وەرگیراوە لە پێگەی ئەلەکترۆنی earthexplorer.usgs.gov

# مەلا و کەسایەتییە ئاینییەکان


مەلا یوسفی گڵێجاڵی


مەلا مەحمود غەفور و مەلا مەجید
لە سلێمانی ١٩٥٧


مەلا سەعید


مەلا مەحمود فەرەج


مەلا محەمەد خەلیفە


حاجی مەلا محەمەد


مەلا عەبدوڵڵا حمە حمە وەیس


مەلا محەمەد مەحمود


مەلا عبدالله یوسف


حاجی محەمەد کاکەهەسەن

# کۆمەڵێک لە کەسایەتی و پیاو و ژنە کۆچکردووەکان


کوێخا غەفور عەزیز


مام حسێن فەتاح


حاجی عەزیز عەبدوڵڵا


حاجی ساڵح بەیجان


مەحمود ڕەحیم


سۆفی عەلی ئەحمەد


حاجی تۆفیق فەتاح


حاجی تۆفیق مەلا فەتاح


جەبار ئەحمەد<br>(مەلا بەرزان)


تەڵاخان


زێبا عەزیز


باوا قادر نادر


محەمەد مەلا فەرەج


فەتحوڵا عەبدوڵڵا


حسێن عەبدولقادر


حسێن حمە ساڵح عەزیز


حەسەن ئەحمەد مستەفا


حاجی محەمەد عەبدوڵا


حاجی محەمەد سەعید


محەمەد فەتاح

حاجی عەلی ئەحمەد

سۆفی یوسف محەمەد

سۆفی مەحمود ئەحمەد



سۆفی کەریم عەبدوڵڵا



سابیر مەحمود



حەسەن حمەساڵح



بەیجان کاکەهەسەن

حەمەئەمین عەبدوڵڵا



حەمەسەعید لەیلێ



ڕەعنا عەبدوڵڵا



حمەصاڵح محەمەد



کافیە سبحان قادر



فاتم قادر مەلا یوسف



کوێخا عەلی فەتاح



عەبدوڵڵا ئەحمەد



عەبدولڕەحمان سلێمان



صدیق حکیم



شێخ کەریم شێخ قادر



شێخ فەرەج فەتاح



محەمەد ئەحمەد عەبدوڵڵا



نوری فەتاح


حاجی محەمەد عەلی


حاجی محەمەد عەزیز _ هەڵەبجە



حمە ساڵح سۆفی محەمەد


لەتیف قادر مەلا یوسف



مەحمود ئەحمەد


ئەحمەد ئەوڕەحمان


ئەحمەد عەبدوڵڵا (تەڵاخان)


ئەحمەد مستەفا وسەین


ئەحمەد قادر محەمەد


ئەحمەد عەزیز ئەحمەد


ئاڵتوون فەتحوڵڵا



مەحمود عەبدولڕەحمان


محەمەد شێخ کەریم


محەمەد عەبدوڵڵا (تەڵاخان)



محەمەد فەتحوڵڵا یوسف


محمد حسین فتاح



مینا محەمەد عەزەم


کافیە عەبدوڵڵا

# کردنەوەی ناحیەی بەمۆ و گواستنەوەی بۆ هەڵەبجە


دەرچوونی فەرمانی ناحیە


دەرچوونی فەرمانی ناحیە


سەرەتاکانی کردنەوەی ناحیە


گەڕانەوە بۆ سەر هەڵەبجە

# بەڕێوەبەرەکانی ناحیەی بەمۆ



عومەر فەرەج ئەمین
لە ساڵی ١٩٩٩ بۆ ماوەی شەش مانگ
بەوەکالەت بەڕێوەبەری ناحیە بووە



سەروەت
٢٠٠٠ _ ٢٠٠٤
بەڕێوەبەری ناحیە  بووە



ساڵح محەمەد
لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٤ _ ٢٠٠٩
بەڕێوەبەری ناحیە بووە



جەمال ساڵح محەمەد
لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٩ _ ٢٠١٤
بەڕێوەبەری ناحیە بووە



عادل مەلا ساڵح
٢٠١٤ _ ٢٠١٩ ب
ەڕێوەبەری ناحیە بووە



سمکۆ سالار موشیر
لەدوای ٢٠١٩ وە
بەڕێوەبەری ناحیەیە

# دەستخەت و بەڵگەنامەکان

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
ژمارەی بڕیار ( ٣٧ )
ڕۆژ: ٤ / ١١ / ١٩٩٦ ز

((( بڕیـــــار )))

پشت بە ئەحکامی ماددەی ( ١٣ ) و بڕگەی ( ٤ ) لە ماددەی ( ١٠ ) ی یاسای ژمارە ( ٢ ) ی ساڵی ( ١٩٩٢ ) وە پشت بە ڕەزامەندی ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ٣ / ١١ / ١٩٩٦ بڕیارمان دا بە:
یەکەم / کردنەوەی ناحیەیەك لە پارێزگای کەرکوك بە ناوی ( ناحیەی بەمو ) وە مەڵبەندەکەی (گوندی کێپال) دەبێ و لە ڕووی ئیداریەوە دەبەسترێتەوە بە قەزای ( خانەقین ) .
دووەم / پێدانی دەسەڵات بە وەزیری ناوخۆ بۆ دیاریکردنی سنووری ئیداری ناحیەی ناوبراو .
سێیەم / وەزیرەکان ئەم بڕیارە جێبەجێ دەکـــەن .
چوارەم / ئەم بڕیارە ڕۆژی ٤ / ١١ / ١٩٩٦ز لە سلێمانی نووسرا .

ئیمزا
کوسرەت ڕەسوول عەلی
سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران

فەرمانی کردنەوەی ناحیە



دەسخەتێکی پێشکەشکراو
بە مەلا مەحمود گڵێجاڵی
١٩٥٤



کۆمەڵێك شیعری
پێشکەشکراو بە مەلا
یوسف گڵێجاڵی
ساڵانی چلەکان

عمر عبدالعزیز الحسینی — بسم الله الرحمن الرحیم
هەڵەبجە
٢٤/شعبان/١٤٢٤
٢٠/تشرینی١/٢٠٠٣
بۆ برایانی عەشرەتی گڵێجاڵ پێشکەشە.

نامەیەکی مامۆستا مەلا
عومەر عەبدولعەزیز
لەبارەی مەلاکانی گڵێجاڵ
٢٠٠٣